جەمیل صائب

# لەخەوما..



پێشکەش کردن و لێکۆڵینەوەی
جەمال بابان



ولید مهدی

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا
١٩٧٥

جەمیل صائب




چیرۆکێکی کۆنی کوردی‌یە لە دەوری شێخ محمود ئەدوێ

پێشکەش کردن و لێکۆڵینەوەی

**جەمال بابان**

لەسەر ئەرکی

**فەوزی صائب**

لەچاپ دراوە

---

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا

١٩٧٥

# پێشەکی

---

## بنەماڵەی صائب

**کاکینە کێیە ؟**

کاکینە جەمیل صائب کـوڕی مەلا ئەحمـەدی ( صائب )(١) کوڕی مەلا قادری قەرەداغی کوڕی مەلا حەسەنە(٢) ٠ لە رۆژی ١٦ی مانگی ئابی ساڵی ١٨٨٧دا لە شاری سلێمانی هاتۆتە دنیاوە ٠ بە منداڵی لە حوجرەی مەلا ئامینە(٣) قورئان و فارسی خوێندوە ٠ دوای ئـەوە لە هەڵەبجە کە باوکی بە قازییەتی لەوێ بوە ، لە حوجرەی مەلا ئەحمـەدی تەکیەیی ( سمایلنامە ، ئەیشودەی شێخ مارفی نۆدێ ، یوسف و زلێخا و گولستانی شێخی سەعدی)

---

(١) (صائب) لەقەبێکە مەلا ئەحمەدی باوکی لە زەمـانی عوسمانییەکاندا بۆ خۆی هەڵبژاردوە .

(٢) ئەم مـەلا حەسـەنە ، هەندێـك ئەڵێـن لە بنچینـەدا خەڵـکی دێی (سەویسێنان)ی سەر بە ناحیەی قەرەداغە .

(٣) مەلا ئامینە کوێرێـکی خوێنـدەواری بەزەبر و توانـای ئەوسا بوە ، حوجرەی هەبوە ، هیچ کاتێك لە (٣٠) منداڵ کەمتری لانەبوە .

خوێندوه • دوای ئەوەی کە هاتونەتەوە سلێمانیێ ، دیسان لە حوجرەی مەلا عەزیزی زلزلەییێ کتێبی فارسیێ خوێندوە ، ئنجا دەستی کردوه بە مەشقی خەتی درشتە ، چونکە لەو کات‌و سەردەمەدا ، منداڵ لە حوجرە قورئان و کتێبی فارسیێ بە ( متن )ەوە خوێندوە ، کە نەختێك گەورە بۆ ئەو کتێبانەی بە مەعناوە خوێندوە و لەدواییدا دەستی کردوە بە خەتی ڕێحانیێ ، دوای ئەوەش مەشقی خەتی وردە •

جەمیل صائب دوای حوجرە چۆتە قوتابخانەی سەرەتاییێ کە ئەوسا هەریەکێك هەبۆ لە سلێمانیێ و هەمۆی سێ پۆل بۆ • دوای ئەوە باوکی بۆ بە قازیێ ( قەلادزە ) ئەمیش لە گەڵیدا چۆ ، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ جۆرە حوجرە و قوتابخانەیەك لەوێ نەبۆ ، ساڵ و نیوێك دانیشت تا گەڕانەوە سلێمانیێ ، ئەوسا لە مزگەوتەکەی هەمزاغای باپیری پیرەمێرد(٤) دەستی کردەوە بە خوێندن، لەم کاتەدا تۆشی نەخۆشییەکی قورس‌بۆ، ئەوەندە کاری لێ‌کرد ، تا دوازۆژی ژیانی شەقڵەکەی پێوە دیاربۆ(٥) ، بەڵام ئەم پیاوە هەر کۆڵی نەدا ، دیسان دەستی کردەوە بە خوێندنەوەی کتێبی فارسیێ و تورکیێ • تا باوکی کۆچی کرد ، ئەوسا بە ناچاری چوە ژێر باری فەرمانی میرییەوە و بۆ بە کاتبی ( وێرگو ــ باج ) لە سلێمانی ، تا عوسمانیەکان وڵاتیان بەجێ‌هێشت‌و ئینگلیزەکان دەستیان بەسەر کاروباری عیراقدا گرت • ئەوسا ئەمیش چوە دائیرەی ( خەزێنە )کە حیساباتی ئێستایە و بو بە کاتب •

لە ساڵەکانی ١٩١٩و ١٩٢٠دا کە ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە سلێمانی دەرئەچۆ و تۆسینی کوردیێ بڵاو ئەکردەوە ، ئەمیش لە تۆسینەکانیدا بەشدار ئەبۆ وەك لەمەودوا باسی ئەکەین • لە ساڵی ١٩٢٤دا دوای ئاوابۆنی حوکمی شێخ مەحمۆدی (حەفید) کە دەزگای میریێ لە سلێمانیێ دانرایەوە ، ڕۆژنامەی

---

(٤) شاعیری بەناوبانگ حاجی تۆفیق ، کە ئەبێت بە خاڵی جەمیل صائب .

(٥) ئەوەبۆ ، تۆزێك بۆی ئەلەنگی .

(ژیانەوە) دەرچو کە ئەم سەرنوسەری بو ، بەلاّم لە دواییدا لەبەر کاروباری
میری وازی لە ڕۆژنامەکە هێنا ، ئیتر لە (خزینە)دا مایەوە و ئەو کارگێڕی بو،
تا لە ساڵی ١٩٤٩دا خانەنشین کرا ، دوای ئەوەش بەینێك بووەوە بە
سەرنوسەری ڕۆژنامەی ( ژین ) کە هی پیرەمێردی خاڵی بو ، تا لە پایزی
ساڵی ١٩٥١دا توشی نەخۆشییەکی قورس بو ، هێنایانە بەغدا ، لەپاش چەند
ڕۆژێك واتا لە ١٣ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٥١دا فەرمانی یەزدانی
بەجێهێنا و تەرمەکەیان بردەوە سلێمانی ، لەسەر تەوقە سەری گردەکەی
(مامەیارە) لە تەنیشت پیرەمێردەوە نێژرا •

کاکینە دوای خۆی شەش کوڕ و دو کچی بە جێ هێشت :

( ١ ) حەمە عەلی : کە سێ ساڵ لەمەوبەر لە شاری بۆمبای لە هیندستان
بە دەستێکی چەپەڵ کوژرا دوای ئەوەی گەیشتە پلەی ( باڵیۆز ــ سفیر ) •

( ٢ ) فەوزی : ئەفسەربو • لەدواییدا چووە (ادارة)ەوە و گەیشتە
پلەی (متصرف) • ئێستا (متقاعد)ە •

( ٣ ) نەوزاد لە حقوق دەرچووە و ئێستا فەرمانبەرە •

( ٤ ) ئازاد : لە کشت و کاڵدا لە دەرەوە خوێندویەتی و ئێستا
فەرمانبەرە •

( ٥ ) بەهزاد : فڕۆکەوانە لە سوپادا •

( ٦ ) شەهزاد : ( پشتیوان ــ محامی )یە •

( ٧ ) نەسرین : کچی گەورەیەتی و شوی کردووە •

( ٨ ) ڕوناك : مامۆستای قوتابخانەیە و شوی کردوە •

ئەم منداڵانەش بەری سێ ژنن ، حەمە عەلی و فەوزی دایکیان یەکە ،
نەسرینیش دایکی جیایە ، منداڵەکانیتریش دایکیان یەکە کە حەپسەخانە و
لە بنەماڵەی عیرفانە لە سلێمانی •

نازناوی جەمیل صائب (کاکینە)یە ، کە ئەمەش حاجی تۆفیقی خـالی لە ئەنجامی خۆشەویستیدا بە سەریا بڕیبێ کە بە واتای کاکی ئێمە دێت •

**کەی دەستکرا بە کوردیێ نۆسین ؟**

لە سالی ١٩٢٠دا و لە زەمانی میجەرسۆندا ، لە ڕێگای ڕۆژنامەی پێشکەوتنەوە کە ئەوسا لە سلێمانیێ دەرئەچێ ، داوا لەو کەسانە کرا کە حەز لە نۆسین ئەکەن ، بە کوردیێ لە بابەت سیاسەت و فەلسەفە و ئامۆژگاری و باسی کشتوکاڵ و سەفـەرنامە و حکایـەت و سەرگوزەشتیێترەوە • • بنۆسن و بۆیان بنێرن • سێ پاداشت دانرا ، بـۆ یەکەم (٥٠) روپیە و بۆ دۆهەم (٣٥) و بـۆ سێهەم (٢٥) روپیـە • ماوەی دوانـزە ڕۆژ دانرا بۆ پێشکەشکردنی نۆسینەکان • لە دواییدا لەناو یانزە نۆسـراودا ئەم سیانە هەڵبژێرران و خاوەنەکانیان پاداشتیان وەرگرت :

یەکەم : جوت و گا ــ شتێکی چاکە • نۆسینی م • نوری واتا محەمەد نوری یاخود شاعیری بەناوبانگ شێخ نوری شێخ صالح •

دۆهەم : بۆچڕۆك ــ نۆسینی زەکی صائب کە مستەفا صائبەو لە شوێنی خۆیدا باسی کراوە •

سێهەم : ڕۆژەوەبـۆتێك ــ نۆسینی محـەمەد جەمیل کـە جەمیل صائبە •

هەرچەندە ئەم ڕۆژەوەبۆتە نۆسینێکی سادەیەو لەکۆتاییەکەیدا هەندێك (تناقضات) و شتی ساویلکە ئەخاتە پێش چاو ، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا وەك یەکەم نۆسینی کوردی و لەو زەمانەدا شتێکی بە نرخە بۆ ئەمڕۆ ، لەبەر ئەوە ئەمیشمان لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بڵاوکردەوە •

**بنەماڵەی صائب(٦)**

ئەم خانەوادەیە جگە لە (کاکینە) و کوڕەکانی کە باسمان‌کردن گەلێك پیاوی لێ‌هاتوی کەیان تیا هەڵکەوتووە ، کە هەمــو لە مەیدانی نوسین و شیعر و هونەردا دەستی باڵایان هەبووە وەك :

**مەلا ئەحمەدی صائب(٧)**

باوکی جەمیل صائبە ٠ لە سلێمانی ساڵی ١٢٧٠(ك) هاتوتە دنیاوە ٠ لە زانستدا پایەبەرز ، جگە لەوەی دەستێکی باڵای لە ئەدەبی فارسی و تورکیدا هەبووە و دیوانی شیعری بە هەردو زمانەکە هەیە ٠

**مەلا ڕەئوف صائب**

لە ساڵی ١٨٧٥دا لە سلێمانی هاتوتە دنیاوە و لە ساڵی ١٩٢٠دا لە تەمەنی (٤٥) ساڵیدا فەرمانی خوای بەجێ‌هێناوە ٠ کوڕە گەورەی مەلا ئەحمەدی صائب و برای جەمیل صائب بو ٠ بو بە قازی چوارتا ٠ ئەمیش شاعیر بو ٠

**عارف صائب**

برای جەمیــل صائبە ٠ ســاڵی ١٨٩٢ لە سلێمانی هاتــوتە دنیاوە ٠ قورئان و ئەدەبی فارسی و خۆشنوسی لە حوجرەدا لە سلێمانی خوێندوە ٠ لە (موصل)یش داخــلی دەورەی ئایینی بوە ٠ لە دواییدا لەگــەڵ سوپای عوسمانی بــە روتبەی ( بلــوك ئەمینی ــ أمین ســریة ) نێــردراوە بــۆ ( ورمــێ و مەراغــە و خــۆی و ســەڵماس ) ، لــەو غەریبــــایەتیەوە شیعری لە سەر دوری و کەساسی و ژیانی پڕ مەینەتی سوپای عوسمانی و

---

(٦) سەیری گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان) ژمارە ٢٨ــ٢٩ی تەمموزی ١٩٧٥ بکە ، کە نوسینێکی بــە عەرەبی بــە قەڵــەمی جەمــال بابــان لەسەر عارف صائب و بنەماڵەی صائب تێدایە .

(٧) سەیری بەرگی یەکەمی (مشـاهیر الکرد)ی ئەمین زەکی بەگ بکە .

شەڕ ڕێك ئەخست و ئەینارد بۆ سلێمانیێ ، تاکو شــەڕ کۆتایێ هات ئەوسا خۆشی گەڕایەوە • لە کاتی فەرمانڕەوایێ شێخ مەحموودا عارف صائب یەکێك بۆ لە گەنجە تێگەیشتــووە پێشکەوتنخوازەکان ، بۆیە شــێخ کردی بە سکرتێری تایبەتێ خۆی • هەر لــەم کاتەشدا بۆ کە نووســێن و شیعر و قسەیخۆشی لە ڕۆژنامەشدا بلاوئــەکردەوە • بەلام بــەداخەوە زۆربەی شیعرەکانی فەوتاون چونکە کەمێکیان نەبێت ئەوانیتــری نەنووسیبوەوە • ئەمیش هەر بە دەستێکی چەپەڵ لە کاتی دەستڕۆیشتنی شێخ مەحموودی (حەفید)دا ، لــە دێی (قەرەچەتان) شــەوی ١٦ی مانــگی مایسی ساڵی ١٩٢٣ کوژرا و هەر لەوێش شاردرایەوە •

نموونەی شیعری لە بابەت (معارف)ەوە :

**موحیطی عالەمی ئیمــکان ئەڵــێی گوڵزاری عــیرفانە**
**لە ساحەی فەن و صەنــعەتدا بە تەنها کوردە حەیرانــە**

**هەمــوو شارێ ترقیکــرد و ڕەونــەق پەخشی ئافــاقە**
**ســلێمانی غوبار ئاڵــوودە ، تا بێ ڕۆ لــە نوقســانە**

**لە ئەخــلاق و لە ئەفــکاردا دەرســی حــیرەت بــوین**
**نموونــەی نەگبەتــین ئەمــڕۆ وەتەنمان بــۆیە وێــرانە**

**لە عیلــمو فــەنو صەنعــەتدا بە جێماوین و داماویــن**
**وەتەن وێران و من گریــان ، خودایە وەختی ئیحســانە**

**دڵــم نایــە دوعای مەحــوی بــکەم چونــکە سلێمانی**
**بە نیســبەت یــادگاری خالصــی ئــەولادی بابانــە**

**٢٢ نیسان ١٣٣٢**

بەلام ئەو پارچە شیعرەی کە لە (جەبهە)وە ناردوویەتی لە ئێران کە بە عەسکەری عوسمانیێ چوە و باسی مەینەتێ و کوێرەوەرێ خۆی ئەکات بە دەست ناهەمواریێ شەڕەوە ، بە جۆرێکە شان ئەدا لە شانی شیعرەکەی مەلا حەمدوون کە باسی سەفەربەلك ئەکات •

عارف صائب ئەڵێت :

**ئاوارەیی خاکی وەتــەن و ســەیر و سەفا خــۆم**
**پامالی غەم و غوربــەت و ســەد دەرد و بەلا خۆم**

**بێ یــار و دیــار وەحشی و مەجنــونی بیابــان**
**مەهجوری سەفای مەجلیسی ئەربــابی وەفا خۆم**

**سەرگەشتەیی سەحرایی خۆیو ساحەیی سەڵماس**
**ریسوایی عەجەم مەسخەرەیی شاه و گەدا خۆم**

**ئەم تالعــە نەحســـە منــی خستــۆتە فــەلاکەت**
**ئاشوفتەیی دەســـتی ســـتەمی بەخـــتی سیا خۆم**

**کەوتۆمەتە ناو تاقــمێ جەنــدرمە ، خــوا مەرگ**
**دوچاری هەزار دەردی سەرێ و قەهر و سزا خۆم**

**سۆڕدانە ، عەرق خواردنە ، کوڕێکە ، مەپرسە**
**سەرسامی هــەزار هەلهــەلەو و ڕەقس و سەما خۆم**

**ڕۆژێك خەبەری حەرب و دەمێك مژدەیی سولحە**
**ئوفتادە لە نــاو دەغدەغەیی خــەوف و رەجا خۆم**

**بێ مەسکەن و بێ چــادر و یاغمــورلغ و یاتــاغ**
**عوریان و پەرێشان بە مەسەل گــورگی چیا خۆم**

**باران و قوڕ و وەحشەت و سەرمایە بە هەر جا**
**پامــالی دەسی شــیددەتی بەفــر و ڕەشــەبا خــۆم**

**دۆ مانگ دەبێ نەمــدیوە سەفای بــەزمی پلاولغ**
**دەرناچێ لــە دڵ هەر بە ئومێــد و بە تەمــا خۆم**

**برسی و ڕەش و ڕۆت ، چلکن و بێ پارە و تۆتن**
**حەسرەت کەشی دۆ قوم جگەرە و پیالەیە چا خۆم**

**وا دامدوریوە پینــە لەسەر چــاکەت و شەڵوار**
**گــۆڕاوە سەر و ســۆرەتی من وەك جلــەگا خۆم**

**نابیــنی طــەراوەت لە ڕەنگــی عــومر و حەیــاتم**
**ئەلحەق وەکو تۆی قۆچە بە بێ بەرگ و نەوا خۆم**

کافر بەزەیی دێتەوە بەم حالە پەشێوە
وا دەربەدەر و قوڕبەسەر و تووشی سزا خۆم

تووکی سەر و ڕیشم لەغەما بۆز و درێژ بوو
بەم وەزعیەتی ڕیشەوە وەك خواجە حەنا خۆم

بۆ شاری سلێمانییە فەریاد و فوغانم
دایم لە خەیاڵ و غەم و تەبدیلی هەوا خۆم

بێ شوبهە لەبەر دەرد و غەم و قەهر و مەرارەت
مەحرومی ثەوابی شەرەف و خێر و دوعا خۆم

بێ تاقەت و بێ ویسعەت و حەیران و پەرێشان
هەر مونتەزیری لوتفی نەبی و فەیزی خودا خۆم

شیعرم وەکو تەبعم کە پەرێشان و خراپە
مەحجوب و سەر ئەفگەندەیی جەمعی شوەەدا خۆم

( عارف ) نەسەری مەرحەمەت و لوتفی خودایە
بۆ مەنفەعەتی دین و وەتەن جان بەفیدا خۆم

مستەفا صائب

برای جەمیل صائبە . لە ٢٥ی مانگی ئابی سالی ١٩٠٤دا لە شاری کفری هاتۆتە دنیاوە ، چونکە ئەوساکە باوکی لە کفری قازی بوە . کە هاتونەتەوە سلێمانی چۆتە قوتابخانەی ئەوساکە کە بە تورکی بووە ، لە زەمانی ئینگلیزەکانیشدا هەر خوێندویەتی ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوسا تاکو پۆلی شەش زیاتر لە سلێمانیدا نەبووە . ناچار دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە . لە سالی ١٩٢١دا لەگەڵ هادی صائبی برای کە مدیری ماڵ بوە لە هەڵەبجە ، چۆتە ئەوێ ، لەوێ بوە بە هاوڕێی عەبدوڵلا بەگی گۆرانو هەندێك لاوی خوێن گەرمیتر ، بە دڵ هەولیانداوە بۆ پێشکەوتنی میللەت و وڵات ، دوای ئەوە بۆ تەواوکردنی خوێندن لەگەڵ گۆران و عەبدولواحید نووری بە کاروان چوون بۆ کەرکوك . لەوێ لەگەڵ قوتابیانیتری کورد کە لە هەولێر و کۆیە و کفرییەوە هاتبونە ئەوێ کۆششی تەواویان کردووە

له خوێنـدن و نیشتمانپەروەرتـدا • له ساڵی ۱۹۲۳دا چۆتـه بەغدا بۆ قوتابخانەی هەندەسه ، لەو ماوەیەدا لەگەڵ چەند گەنجێکی کەدا لەوانەی بەغدا ( کۆمەڵی لاوان )یان(۸) پێـك هێنا واتا ( لاوانی کـورد ) کە ئەم سکرتێری کۆمەڵەکە بووە • ئەم کۆمەڵەیە گەلێك ئیشی دڵسۆزانەی کرد • له پشتوی هاوینیشدا که ئەچووەوە بۆ سلێمانی لـه قوتابخانەکاندا دەرسی ئەوتەوە ، به تایبەتی که (زانستی) کرایەوە ، مامۆستا صائب مەردانه چۆوە پێشەوە بۆ یارمەتی و کۆشش لەگەڵ قوتابیەکاندا • له سـاڵی ۱۹۲٦دا که قوتابخانەی تەواو کرد گەڕایەوە وڵات و بۆ به موهەندیس لـه دائیرەی ئەشغال ، هەر لـەم کاتەدا بۆ که لەگـەڵ چەند هاوڕێیەکـدا کۆمەڵەی (زەردەشت)یان(۹) پێکەوە نا که هەر ئەم (معتمد)ی بو • له ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵە شێخ مەحمودی حەفید و شێخ سەلامی شاعیر و عەبدولواحید نوری و شەوکەتی عەزمی بابان و ... هەندێکیتر بون ، له ساڵی ۱۹۲۸دا که ئینگلیزەکان ویستیان شێخ مەحمود له دژی حکومەت ڕاستکەنەوە ، کۆمەڵه شێخ مەحمودی تێگەیاند که ئەمە هیچ سودێکی تیـا نیه ، تەنها بۆ ئینگلیز نەبێت ، ئەویش له شوێنی خۆی نەجولاّ • دوای ئەوە له سەر ئیشکردن و سیاسەت مستەفا صائب گوێزرایەوە بۆ ڕەواندز ، دوای ئەوێ بۆ موصل ، له دواییدا بۆ بەسرە و له ساڵی ۱۹۳۰دا بۆ حیلله و لەوێوە بۆ بەغدا •

لەم کاتەدا بۆ لەگەڵ تاهیر بەهجەت مەریوانیدا له بەغدا دەستیان کرد به زیندوکردنەوە و لـه چاپدانی دیـوانی شیعری شاعـیرەکان و گەلێك نوسینی بەنـرخیتر کـه به زنجـیرەیەك دەرچـو به نـاوی (کوردی و

(۸) سەیری (ڕۆشنبیری نوێ)ی ژمارە ۳۹ نەورۆزی ۱۹۷۵ لاپەڕە ( ۱ ) بکه ، (مێژویەکی له بیرچووەوە ــ کۆمەڵەی لاوان) به قەڵەمی جەمال بابان .

(۹) سەیری گۆڤاری (بەیان) ژمارە ۱۹ تشرینی دووەمی ۱۹۷٤ لاپەڕە ( ۸ ) بکه ( له بابەت کۆمەڵەی زەردەشتەوە ) به قەڵەمی ئارام .

مەریوانی)یەوە(١٠) ، کە یەکەمیان مامۆستا صائب بۆ • دوای ئەوەش هەرگیز لە خزمەتی گەل و وڵات درێغی نەکردوە و هەمیشە پێشڕەو بووە ، ئێستا خانەنشینە لە بەغدا و بەو مۆچەی تەقاعودییەی کە هەیەتی گوزەران ئەکات و ژنیشی نەهێناوە •

مامۆستا (کوردێ) یاخود (زەکی) یاخود مستەفا صائب نوسەرێکی قەڵەم ڕەنگین و (باحث)ێکی وردکار و پیاوێکی قایمکارە ، نوسراو و وێنە و کتێبی بەنرخی گەلێك لە خزمەتدا هەیە(١١) •

مستەفا صائب یەکێك بو لەوانەی لە گرەوەکەی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ساڵی ١٩٢٠دا بەشداربوون • بە نوسینێکی بەنرخ لەژێر ناوی (بۆچڕوکێك)دا(١٢) و پاداشی دوهەمی وەرگرت و هەر لەو ڕۆژنامەیەی ئەو ساڵەدا بڵاوکرایەوە • زۆری هەست و خواستەکانی لەم بۆچڕوکەدا (ڕەمزی)ن و زیاتر مەبەستی نەتەوە و وڵاتەکەیەتی • بە کورتی مام مستەفا گەنجینەیەکی بەنرخو ماڵەوماڵە• بەڵام لە هەمان کاتدا سەربازێکی نەناسراوەو هەرگیز خۆی دەرنەخستوە ، لە هیچ شوێنێکدا ناوی خۆی نەبردوە •

**جەلال صائب ، هادی صائب ، ئەنوەر صائب** هەرسێکیان برای خوالێخۆشبو جەمیل صائبن ، هەمو بەرهەمی ئەدەبی و مێژوییان هەیە ، ئێستاش دەست خەتێکم لایە کاتی خۆی خوالێخۆشبو جەلال ئەفەندی دایمێ • کە لە مێژوی کورد ئەدوێ و ئەویش لە کاتێکدا دەستی کەوتبو کە

(١٠) سەیری نوسینێك بکە لەسەر (تاهیر بەهجەت مەریوانی) لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٢٣٨ ڕۆژی ١١–١٠–٩٧٤) بە قەڵەمی جەمال بابان .

(١١) ( متن )ە ئەسڵیەکەی (لە خەوما) بە قەڵەمی جەمیل صائب لای ئەم بەڕێزە بو .

(١٢) بە پێویستی نازانم ئەم بۆ چڕوکە لێرەدا بڵاو بکەمەوە چونکە شوێنی ئەو نیە . جگە لەوەی کە لە (ڕۆشنبیری نوێ)ی ژمارە (٣٤ ڕۆژی ٢١–١٠–١٩٧٤)دا ، بە قەڵەمی جەمال بابان بڵاو کراوەتەوە .

له ناوچەی بادینان‌دا قائمقام بو ، ئەو دەست‌خەتە گەلێك بەكەڵكم هاتووە • له وردكردنەوە و (مراجعات)مدا •

**شەماڵ صائب**

ئەمیش گەنجێكی هەڵـــكەوتوی بەنرخە بە تایبـــەتی لە گۆرانی و مۆسیقادا و ماستەری لە ئەمەریكا وەرگرتوە ، كوڕی جەلال صائبە •

# ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە لە كوردەواریدا

هەندێك بەروبومی ئەدەبی هەن نرخیان هەر لەوەدا نیە كە ئایا لە ڕوی ڕۆشنبیری و هونەرەوە بایی چەندن و چەند نین و تا چ ڕادەیەك لە دنیای خەیاڵ و هونەری ئـــەدەب و پـــەروەردەی زەوقـــدا دەوری كاریـــگەر دەگێڕن ••• بەڵكو نرخی ڕاستی‌یان لەوەدایە كە بەڵگەی زەمان و چەرخی خۆیان و بە وردی چـــرای ڕەخنە ئاراســـتەی كەلێن و قـــوژبنی تاریكی كۆمەڵەكەیان و ئەو قۆناغە ئەكەن كە پێیدا ڕۆیشتون ، وەك ئاوێنە ڕوداو ئەخەنە ڕو •

ئەی ئەدەب ئاوێنەی ژیان نیە ؟

بۆنمونە نوسینەكانی ئەلكسەندەر دۆماس و شارلزدیكنز و مەكسیم گۆركی •••• ئەمانە هەمـــو پەردە لـــە ڕوی دەورێـــك هەڵـــئەماڵن كە خاوەنەكانیان تیایدا ژیاون • ئەگینا نوسەر ماددەكەی لە كوێوە ئەهێنێت لە ڕوداوی دەوروپشتیەوە نەبێت كە بە چاوی خۆی ئەیبینێت یا بە گوێی خۆی ئەیبیسێت بە جۆرێك كار ئەكاتە سەر دەرون و ئەو دیو دەرونیشیەوە •

بەداخەوە تا ئەم دواییە لە كوردەواری‌دا كارێكی ئەدەبی ئەوتۆ سەری هەڵنەداوە كە گرێی ڕوداوی ڕۆژێك لە ڕۆژەكانی مێژومان بۆ بكاتەوە و

چمکێکی‌مان بۆ دەرخات ، بەو شێوەیەی کە لەناو میللەتانی دەوروپشتماندا هەیە • بۆیە ئــەوەی هەبێت بە دانسقە دائەنــرێت ، بەتایبەتی ئەگەر ئەو بەرهەمەش لە خۆیدا ، شتێك بێت •

لای خۆمان ڕیالیزمی ڕەخنە Critical Realism بە شیعر لە زەمانی ئەحمەدی خانی‌یەوە (١٦٥٠ــ١٧٠٦) دەستی پێ‌کرد(١٣) و بەرەبەرە پەرەی سەند لە زەمــانی حاجی قادری کــۆیی‌دا (١٨١٦ــ١٨٩٧) • ئنجا شاعیرەکانمان (پیرەمێرد ، زێوەر ، بێکەس ، ســەلام ، جگەرخوێن •••) پەیڕەوییان کرد • بەڵام بە چیرۆك (ڕۆمان) یاخود سەرگوزەشتە ، ڕەخنە ئەوەندە برەوی نەبوە ، چونکە هونەری چیرۆك‌نوسین وەك شیعر سەری هەڵنەدابو یاخود شان بە شانی ئەو نەڕۆیشتوە •

لەم بابەتەوە لە ساڵەکانی بیستدا ئەم (لە خەوما)یەی لەمەڕخۆمان و (مەسەلەی ویژدان)ەکەی ئەحمــەد موختار جافە جگە لە چــیرۆکی زۆر و زەبەندە لە فۆلکلۆردا کە نەنوسراوەتەوە •

لە ساڵەکانی دوایی‌تریشدا مامۆستایان حــوزنی موکریانی و شاکیر فەتاح و ئیبراهیم ئەحمەد ، لە چیرۆکدا پێشڕەو بون •

لە خەوما یەکێکە لەو کارە ئەدەبیانەو ، بە شێوەیەکی ساکار و نەرم و لەسەرخۆ (دەوری حوکمی شێخ مەحمودی حەفیدی لە سلێمانی) خستوتە بەر ڕۆشنایی و بەرچاوی خەڵك • هەرچەندە زۆر کەس ئەڵێن کەوا (تەنها لایەکی ئەو دەورەی گرتووە نــەك هەمو لایەنەکانی • واتــا تەنها لایەنە ــ سلبی ــیەکەی یاخود تاریك و کاڵ و کرچەکەی گرتــووە نەك هەمو سەرێکی) کە ئەمەش ڕاستە و بێ‌گومان هۆی تایبەتی خۆی هەیە ، وەك لە

(١٣) ئەگەر زیاتر وردی بکەینەوە لە زەمانی بابا تاهــیری عوریاندا بە شیعر هەبوە ( ٩٣٥ ــ ١٠١٠ ) جــگە لــەوەی ڕەخنە لە فۆلکلــۆردا زۆرە کە مێژوەکەی نازانرێت .

دواییدا ڕوونی ئەکەینەوە • بەڵام ئەگەر ئێمەش ئاوڕێك لەو ڕۆژانە بدەینەوە و بە ئینساف و وەك خاوەنی ویژدان سەیری لایەنە (باشەکان یاخود ئیجابیەکان یاخود ڕوونە پێشکەوتوەکان) بکەین ، ئایا چی ئەبینین ، بەداخەوە شتێکی ئەوتۆ نابینین کە بتوانین بەرگری لەو دامودەزگایە بکەین • بەڵێ من ئەو دەورەم بەچاوی خۆم نەدیوە و تیایدا نەژیاوم ، کە ئەمە کارێکی زۆر ئەکاتە سەر بیر و هۆشی نوسەر • بەڵام ئەو دەمەش ئەوەندە دوور نیە لێمانەوە و بە سەدەها پیاوانی دنیا دیدە و ئاغر و ڕاستگۆی ئەوسا ، هەمو شکور تا ئێستا ماون و تاڵی و ناخۆشی ئەو سەردەمەیان هەمو چێژتوە • ئەوی خەتاو ئەنجامی ئەو بارە شێواوە ناهەموارەش بخاتە سەر شانی تەنها شێخ مەحمود خۆی ، زوڵمێکە لەو پیاوەی ئەکات •

کەوابو نرخ و هونەری ئەم کارە ئەدەبیە ، تەنها لە دەرخستنی کەل و قوژبنی تارێك و هەردو نشێو و گۆمە بۆگەنەکان و زەلکاوەکانی زەمانی شێخ مەحمودایە و بەس • بەڵام زیاتر بە شێوەیەکی ڕۆژنامەچیانە و ڕیپۆرتاج (چونکە کاکینە خۆی بە ڕۆژنامەچیەتی دەستی پێکرد و هاتە کۆڕەوە) نەك وەك چیرۆك ناوی پاڵەوانەکان بهێنێت یاخود ناویان لێ‌بنێت و لایەنی لێکدانەوە و (تحلیل) بگرێت • بۆیە لەم ڕوەوە من (مەسەلەی ویژدان) بە باڵاتر و سەرکەوتوتر دائەنێم ، بەڵام لە هەندێك ڕوی‌ترەوە ئەم لەپێشترە وەك لەمەودوا بۆمان ڕوون ئەبێتەوە •

## دەوری شێخ مەحمود

شێخ مەحمود دوو جار حوکمی سلێمانی کرد ، یەکەم جار لە مانگی تشرینی دوەمی ساڵی ١٩١٨وە تاکو مانگی حوزەیرانی ١٩١٩ (شەڕەکەی دەربەندی بازیان) و گیرانی شێخ بە دیل • دوەم جار لە ئاخر و ئۆخری ساڵی

۱۹۲۲وه وه تا مانگی ته‌موزی ۱۹۲٤ كه هێزی ئینگلیز سلێمانیێ داگیرکرد ٠

گومانی تێدا نیه كه‌وا كۆمه‌ڵه (ظروف)ێكی ناو شـــار و ناو كورد خۆی و ده‌وروپشت و هه‌مۆ جیهان ده‌وری حوكمی شێخیان دابۆ كه لێره‌دا ماوه‌ی درێژه پیٚدانیان نیه ٠ دیسان گومانیشی تیا نیه ، كه‌وا شێخ مه‌حمۆد خۆی پیاوێكی به ئایین و ڕاست و ئازا و نیشتمانپه‌روه‌ر و دڵ ساف و داوێن پاك بو ٠ به‌ڵام له هه‌مان كاتدا پیاوێكی خۆش باوه‌ڕو ته‌بیعه‌ت عه‌شایه‌ری و نیمچه خوێنده‌وار و كه‌م ته‌جروبه بۆ له مه‌یدانی سیاسه‌ت و درۆ و ده‌له‌سه‌ی ناو ده‌وڵه‌تاندا ٠ جگه له‌وه‌ی هه‌مۆ جۆره كه‌سێك ده‌وریان دابۆ ، له كوردی پاكی نیشتمان په‌روه‌ر و ئینگلیزخواز و جلخوار و ته‌ماعكار و خۆپه‌رست ٠٠٠٠ هه‌ر یه‌كه‌ش به لایه‌كدا ڕای ئه‌كێشا و هه‌ر كه‌سه له ئاشێكی ئه‌كرد ٠ شێخی دلپاك و به دین و دۆ دڵ به ده‌ستیانه‌وه گیری خواردبو ، هه‌ر ڕۆژه له‌سه‌ر ڕایه‌ك و هه‌ر ده‌مه بـــه جۆرێك ئه‌جولایـــه‌وه ٠ پیاوی خـــراپ و خۆپه‌رست و چاو له دۆ سه‌ركه‌وتۆتر بۆن ٠ په‌رژینێكی سفتیان له ده‌وری ته‌نی بۆ ٠ ئه‌میش له ئه‌نجامی فڕوفێڵ و ته‌ڵه‌كه و ده‌ست بڕیندا بڕوای بـــه ئینگلیز نه‌مابۆ ٠ ئه‌وه‌نده تێگه‌یشتبو لێیان كه هه‌مۆ كرده‌وه‌یه‌كیان و گشت جولانه‌وه‌یان به‌رژه‌وه‌ندی پیره ئیمپریالیزمی تێدایه ٠

ئه‌مانه هه‌مۆ تێكه‌ڵاوبۆبـــۆن و به‌ره‌نگاری شـــێخ ئه‌بۆن ، به‌ڵام له هه‌مانكاتدا پیاوی ڕاست و پاك و دڵسۆزیشی هه‌بۆ ، هه‌رچه‌ند ده‌فیـــان ده‌نگی نه‌ئه‌دا ، جگه له‌وان خه‌ڵكی سلێمانی به‌تایبه‌تیێ و كورد به گشتیێ ، گه‌لێك قوربانی‌یان دا و فیداكارییان زۆر بۆ ، خۆیان به‌رامبه‌ر به گرانیێ و قات و قڕیێ ، ڕاو و ڕۆتی عوسمانیه‌كان و زوڵم و زۆریان ، بومباردمان و ئاگر بارانی ئینگلیز و زۆر كاره‌ساتی سه‌ختیتر ڕاگرت ٠

به‌ڵگه بۆ ئه‌وانه‌ی باسمكـــردن یادداشتـــه‌كه‌ی خوالێخۆشبۆ ڕه‌فیق حیلمی‌یه كه ئاوێنه‌یه‌كی ڕۆنه بۆ تاودانه‌وه‌ی باری ئه‌وسای حوكمڕانیێ شێخ مه‌حمۆد ، كاروبار چۆن ئه‌ڕۆیشت و كیێ ئاش وه‌ستا بو ؟

مامۆستا ڕەفیق حیلمی ئەڵێت «شێخ مەحمۆد دوای ئەوەی کە بو بە حوکمــداری کوردستان کەوتــە وەستاوێکی گرنــگەوە ، لە کاروباری حکومەتدا کەم تەجــروبە و لە مەیدانی سیاســەتدا بێ کەس بو ٠٠»(١٤)

دوابەدوای ئەوە ئەڵێت «ئازایێ و بێترسێ و کەمتەرخەمێ خۆشی لەو هۆیانە بۆن کە بە هەڵەی بەرن ٠ لەبەر ئەمــە بەختی زۆ زۆی کردە کزێ ، چونکە ڕێ و شوێنێك کە لە هەڵسوڕاندنی کاروباری عەشایەری‌دا لەسەری ڕۆیشتبۆ ، بۆ تەگبیر و ڕای ئیشی حکومەت بەکەڵك نەئەهات ، ئەوانــەی کە لە حوکمدار نزیك ئەبۆنەوە ، لەم بابەتە بۆن ٠٠٠ دەست و پێوەندی نەفام و نەخوێندەوار ، دەور و پشتی چــاو برسی و دوای تالان کەوتۆ ، تۆکەری خەنجەر لە پشت و عەشایەری تفەنگ لە شان ٠٠٠»(١٥) ٠

یەك دۆ پەڕە دوای ئەوە ئەفەرموێت « ٠٠٠ هەرچــەندە لە بەغدا و تورکیاوە هەندێك لە زابتە کوردەکان هاتبۆنەوە سلێمانی و لەو سەردەمەدا هەندێ خوێندەواری باش و نیشتمان پەروەر لەوێ بۆن و ئەیانویست کە تێبکۆشن و یارمەتی حوکمدار بدەن ، بەڵام ڕێکەوتنی تاقمی دەوروپشتی حوکمدار و ئەمانەی‌تر نەئەگونجا و تاقمی یەکەم لە بەینی حوکمدار و تاقمی دووەمدا ، لە خەنجەر و دەمانچە دیوارێکی دروســت کردبــۆ ، ئەگەر حوکمدار بیویستایە ئەم دیوارەی ئەڕوخاند ، بەڵام نەترســان لە دواڕوژ و ئازایێ و کەمتەرخەمێ و گرێی نەفسی کە بەرامبەر بە زابت و منورەکان پەیدای کردبۆ بەرهەڵست بۆ ٠٠٠ عیزەتی فاتە و فایقی تاپۆ کە توانیبویان لە شێخ مەحمۆد نزیك‌بکەونەوە ، تا بەینێك (کــاتم اسرار)ی بۆن ، زۆ لێی جیابۆنەوە ٠٠ زۆری تریش بە تەمابۆن کە تاسەر لەگەڵ شێخ مەحمۆد بن و

---

(١٤) یادداشت ، بەرگی یەك ، بەشی یەك ، لاپەڕە ٦٧ .

(١٥) هەر ئەو بەرگ و بەش و لاپەڕەیە .

لێرەدا پیاو ئەو مەسەلــە عەرەبییەی بیرئەکەوێــتەوە کە ئەڵێت (ما أشبه الليلة بالبارحة) .

بەبێ درۆ یــارمەتی بدەن بەڵام داخەکەم ئاواتەکانیان نەچوە سەر » تاکو ئەڵێت «•• لەمەش جێی داخ‌تر ئەوەبو کە هەندێك ناڕەسەن و پەسمایە لە ئەهلی شارەکەش بوبون بە پۆلیس و نۆکەری ئنگلیزەکان و شانازییان بە جاسوسییــەوە ئەکرد ••• نۆکەر بــە خەنجەر و دەمــانچەوە ، دایــەن و کەنیزەکان بە هاڕەی خشڵ و هەیاسە و لاگیرەی زێرینەوە کەوتنە کەش و فش ، شەرواڵ و مرادخانی و چەفتە و مشکێ سورمە و ئاوریشمی دەستەی شێخان و دەس و پێوەند ، دیمەنێکی‌تری دابو بە سلێمانێ»(١٦) •

جا بۆئەوەی خوێنەری ئازیز زیاتر لەزەت لە ســەفەرەکەی مامۆستا صائب وەربگرێت پێویستە چاوێك بخشێنێت بە ژمارەکانی یادداشت‌دا و بەو کتێبانەی‌تردا کە باسی ئەو دەورە ئەکەن •

بۆ نمونە ئەمەش پارچە هەڵبەستێکی شێخ محەمەد خالصی(١٧) کوڕی شێخ‌ڕەزای تاڵەبانییە کە لە ساڵی ١٩٢٤دا بۆ شــێخ مەحمودی نــاردوە و چونیەتی باری ئەودەمە ئەخاتە ڕو •

**لەپاش دامان و پا ماچکــردن و عەرزی دوعا خــوانێ**
**وەڕین دەست پێ دەکا بەچکەی گەماڵی پیری گەیلانێ**

**دەڵێ بۆچی دەرت‌کردم ئەگەر پاست نەکەم بە خوا**
**هەمو چەڵتوکەکەت دەخوا بــەرازی قوتبی ڕەببانێ**

**یەکانە و پەڵغ و ماڵوســی فەوێ قوڵی گــەلێ زۆرە**
**بەری ملیان لەکــوێ دەگرێ پشیــلەی کانی‌ئاسکانێ**

**لەپاش تــاڵان و عــەزل و لانــەواز و خانە ویــرانێ**
**حەوالەی خۆت دەکەم قوربان چلۆن بێم بۆ سلێمانێ**

**لە بەرچاوت وەکو یەك وایە بێ فەرقن لە خزمەت تۆ**
**شەهێن و حاجی لەقلەق، شێر و ڕێوێ، مرشد و جانێ**

---

(١٦) یادداشت ، جزمی یەك ، بەرگی یەك ، لاپەڕە (٦٤) .
(١٧) کە لە ساڵی ١٩٢٨دا فەرمانی یەزدانی بەجێ‌هێناوە .

کەر و گا خەرجی بار و جۆتە ، ئێستر ماڵی کاروانە
ئەمانــە نابنــە کوێخــا و رئیس و مــیری دیــوانێ

بەیار کێلان و گای لەڕ ، پیر و کچخواستن ، ژن و تدبیر
سەگ و جۆ ، ئەسپ و ئێسك ، بۆق و سەردار جرجی ناوکانێ

عەبا و کەر ، فێست و ڕێوی ، ورچ و شەپقە ، مێزەر و مەیمون
حەیا و کوێــر ، شــەرم و دۆم و وەفا و نامــۆس و سۆزانێ

لەکوێت دۆزینەوە ئەم کــوێر و عــۆرانەی لە خــوا عاســی
چلۆنت کەوتــە خاتر مشــکە کوێــرەی ورچــی کوێســتانێ

هەمــوو شــێر و پڵنگــن وەختی نان خــواردن لە ئەتــرافت
سمێڵ بابــڕ ، کفــن دز ، کەڵلــە خــڕ ، پەرچــەم مەریوانێ

دوعات بــا بۆ بــکەن ئەمجــا ، بە تعبیریان نــەکەی زینهــار
مــەلا و دەروێش و ســۆفێ و شێــخەکانی لۆقمــە باتــمانێ

لــە ڕۆژی وا پیــاوێك چاتــرە بــۆ تــۆ لە دۆ ســەد کەس
هــەزاری لــێرەیەك نــاکا ، دە پــارە و پــول و تــارانێ

لەســەر ئــەم مصرعە لادەم بچــم بــۆ مصرعی ثــانێ
بڵێــم ئــەی پاســەوانی میللــەت و ڕێــگەی موســڵمانێ

وجوودت فەخرە بــۆ من چونــکە لای من فەخــری کــوردانی
نەوەی کاك ئەحمــەد و نوتفــەی حسین و شــێری یەزدانێ

. . . . . . . . . . . . . . (١٨)
. . . . . . . . . . . . . .

هەتیو چــیت وت زمانت هەڵــوەرێ غەلەتێکی گــەورەت کرد
لــەلای خــۆت شــاعیری هێشــتا قســەی پیاوانــە نــازانی

خراپــەی چاکەیــە ، زامــی شــیفایە ، حیدەتی حیلمــە
جنێــوی فەخــرە ، تــاڵانی عەتایــە ، عەفــوە عنــوانی

کەرەمکــار و وەفــادار و وەلــی خــولق و عــەلی کــردار
تەبیعــەت چــاك ، تەبیعــەت پــاك و پــڕ نــوور و نــوورانی

---

(١٨) دوو بەیتی فارسین بە پێویستمان نەزانی بڵاویان بکەینەوە .

**فەلەك مل شۆڕ نەکا ئەمڕۆ لەژێری پێی کەسێ شێخ مەحمود**
**مەلـەك مەجبـور ئەبـێ ئەمـڕۆ لە تاعە و حـوکم و فەرمـانی**

**ئەوەندەی بـاری تەعنـە کەوت بە ملـدا (خالیصی) ئەمـڕۆ**
**ئەهاتـە خزمـەتت قوربـان وەلـێ زامـدارە سـەرشانی**

هەر بۆ ئاگاداری و بەڵگەی قسەکانی پێشتومان ئەم پـارچە شیعرەی ئەحمەد بـەگی صاحیبقران (حەمدی)یش ئەخەینە پێش چـاو کە لەبابەت (٠٠ ئیدارەی کوردستانی جنوبی ساڵی ١٩٢٣)وە توسیویەتی(١٩) :

**باسی تەشـکیلاتی ثانی هـەر ئەکەم بـۆ پێـکەنین**
**کەمترین بـۆ گەورەتر ، هـەم گەورەتر بـۆ کەمترین**

**ناعیلاجم ئیسم و شوهـرەت باس ئـەکەم عاجز مەبن**
**تـا ببینـن شـکلی وضعیـەت بەجـاری قارئـین**

**(کویلی مولازم) وەزیـری خاصـەیی قـوّلی یەسـار**
**ئیبنی سـەر مزگەوت وەزیری موشفیقی قوّلی یەمین**

**کاتبی مابەین بۆ (تاهـیر) تەرجـەمەی حـالی بـکەم**
**پیس ئەبێ دیـوان لەپاشا موستەحەققە بـۆ دزین**

**حەیفە تەعریفـی ڕەشـە و عمی و ... دایـە نەکەم**
**ناکرێ ، ئەعضان ئەمانـە چونـکە عضوێـکی بەرین**

**خەزنە کیسـەی باخەڵ و مەصرەف ... حاجی فتاح**
**حامیلی سینی حەماڵ و ظـەرفی پڕ ماشـێنی شین**

**تابعین ئەلـوات و هـەرزە قاتیـل و دز بـۆ هەمـۆ**
**ئەهلی وجدان و شـەرێف و تێگەیشتـۆ مونـکرین**

**زابتـانی عەسـکەری زۆرە و زرە و ئـەولا درێـژ**
**هەردۆ جل خـوار و قلیش و یۆنسی بـاجی هەمین**

---

(١٩) وەك لە دیوانی ئەحمەد حەمدی بـەگ صاحیبقڕانەوە وەرگـیراوە ، لە بڵاو کراوەکانی نامەخانەی گەلاوێژ چاپخانەی ئەسعەد . بەغدا ١٩٥٧ . لاپەڕە (٨٦) .

ئەمری یومیــە هەمــۆ هەر حەپس و زنجیر و جــەزا
فیکری لەیلیە هەمــۆ هەر کوشتن و یەغما و دزین

حاکمی شەرع و عەدڵ مەحکومی عالەم مارفە شــەل
مخبــری صادق بــۆ کاذب سۆئی ظــەن علم الیقین

قاوەچی و پێش خــزمەتی دیــوانی عــالی دۆســمە
ئەم بۆ مەشهۆری قولی بۆ ئەو بۆ مەعرۆفی شەلتین

موحتــەرەم ماموری تەشریفاتی دەولــەت بــۆ ...
ناظــری فەرشــە رەحە ، بۆ خەلوەتی ئامە امــین

جائزە بــۆ میللــەت و کوردایــەتی بێ ڕەش‌بەلــەك
باجی ڕەحمــە بێ‌قــەزابێ نایــەلێ ڕێــك هەلپەڕین

گەرچی ئێستا مــردوە موقعیــە باسی هەر ئــەکەم
نانــەوا گوێ ڕەپ بۆ شەخسی اول‌و مەجلیس نشین

جەردە شێخ ... کە مورشید بۆ لەگەڵ دەرویشەکان
من کە وام‌زانی لە کــۆرەی حەلــقەیی ذکــرا فڕین

سەیری سیرەت کەن کە صورەت ڕۆ کەشێکی صفیە
گورگ ئەچێتە پێستی مەڕ ظالم ئەبێتە پۆست‌نشین

ناوی جەمعیەت موجاهیــد بۆ وەظیفــە جیا جیــا
دەستە دەستە قاتیــل و دز بۆ عبــادی موسلیمــین

باسی نەفسی خۆی بە فەضــلە من ئەزانم موختەسەر
ئاشــکارە قیمــەتی گــەورە بــە تەعــریفی قریــن

ناوی ئــەو وەختــە بە قانــۆنی طبیعــەت دانــرا
چەرخی چەفیەو زلفو کاکۆل دەوری سەرسنگ‌وسەرین

هاتە دەر بۆ ساڵی تاریخی (کەوا آخر شری)= ١٣٤٣هـ
کەوتــە بانــەوبان بە یــادی ( بانە ) بۆنە قەل فڕین

وا بە حیددەت چاوی هەڵهێنا وەتەن دیسان ئەلێ
من هیلاکم بــۆ خەلەف تــۆ چارەجــۆی و دۆربین

واضحی نالی‌ی دەوای دەردم بــە تەوریــەی بــلێ
شینە یاسیــنە دەخیلــە جارێ یاسین جارێ شــین

**جا دوعاکـەم بۆ بـکە ئەممـا وەکـو ویردی زمـان**
**تا سەرا پەردەی فەلـەك ماوە هەتا فـەرشی زەمین**

**( ژەببی مۆی لێ بێ زمانی پەنجـەکانی هەلـوەرێ**
**هەرکەسێ گوڵشەن بە دەردی کوڵخەنی دۆزەخ بەرێ )**

**تاقمە سیاسییەکانی ئەو دەمە**

وەك بە قسەکانی لەمەوپێشدا بۆمان دەرکەوت ئەوسا چەند تاقمێك هەبۆن لە سلێمانیدا ، کە هەر لایە لە سەر رایەك بۆن • هەبۆن تورکچێ و بە ناوی سۆلتان و ئـاینی ئیسلامەوە دابۆیانـە بـەری ، ئـەو زەمـانە (ئۆزدەمیر)یش(٢٠) هێشتا بە شـاخەکانی رەواندزەوە مابۆ هانی ئەدان ، ئەمانە جلخواریان پێئەوتن ، هەبۆن سەر بە ئینگلیز بـەو بڕوایەی (وەك خۆیان بلاویان کردبوەوە) رزگارکەری قەومە بچـۆکە بێدەسەلاتەکانن لەژێر چنگی دەولەتە گەورەکان ، بەلام لە دواییدا کە هەمۆ شتێکیان بـۆ رۆنبوەوە ، ئەوانیش بایان دایەوە • هەشبـۆن کوردپەروەر و نیشتمـان پەروەر ، بۆ پێگەیشتن و پێشکەوتنی میللەتەکەیان هەولیـانئەدا • کاکینە یەکێك بـۆ لەوانە ، هەرچـەندە هەندێك هـەن بە ئینگلیزخوایان ئەدایە قەڵەم • ئەمەش راست نیە و هەلبەستە لەلایەن ئەو تـاقمەوە کە حەزیـان لێنەئەکرد و لە بیر و ڕادا جیاواز بۆن • ئەگەر واش بۆبێت و لە هەوەڵەوە پڕوپاگاندەی ئینگلیزەکان کاریان تێکردبێت بەلام لە دواییدا ئەویش هەمۆ شتێکی بۆ رۆن بووەوە و ئینگلیزی ناسی ، ئـەی لە تـاو بۆمباردومانی ئینگلیز ئەویش لە شارەکەی خۆی ئاوارە و دەربەدەر نەبو ؟

---

(٢٠) ئۆزدەمیر یا خود (علی شفیق) ئەفسەرێکی تورك بۆ لـە کەمالییەکان لـە ناوچەی رەواندزدا ئیشی پێسپێردرابو ، قسەو پڕوپاگاندەی تا رادەیەك کاری کردبو . ئەمە لە کاتێکدا بۆ کە ئینگلیزەکان هاتبۆنە کوردوستانەوە، واتا لە سـالەکانی بیستدا .

**بۆمبا بـارانی سلێمانی**

سالی ١٩٢٣ ئینگلیز دەستی کرد بە بۆمباردمانی شاری سلێمانی ، بۆ ئەوەی شێخ مەحمودی تیا دەرپەڕێنێت ، لە کاتێکدا کە شێخ و دەستە و دایەرەی بەینێك بو شارەکەیان چۆل کردبو • دانیشتوانی شارەکەش لەتاو بۆمباردمان و لە ترسی ڕاو و ڕوتی عەشایەر و بەتایبەتی هەمەوەند ، ئەوی لە توانایدا بۆ سلێمانی چۆل‌کرد و هەریەکە بە لایەکدا بۆی دەرچو • شێخیش لە ناوچەی سورداش و لە ئەشکەوتەکانی جاسەنە ، بەینێـك مایەوە تاکو ڕۆژنامەی (بانگ حق)یان لەوێ دەرئەکـرد ، ئەوەبو لەوێشەوە چون بۆ ناوچەی پێنجوێن بەلام شاری سلێمانی بەردەوام یاخـود پچڕپچڕ هەر بە دەست دەستە و دایەرەی شێخ و عەشایەرەوە بو •

جەمیل صائبیش یەکێك بـو لەوانەی بە خۆی و مـال و مندالییەوە سلێمانی بەجێ‌هێشت ، چو بۆ کەرکوك ، دو سالێك لەوێ مایەوە تا سالی ١٩٢٤ کە حکومەتی عێراق دامەزرا ، ئەوسا ئەویش گەڕایەوە سلێمانی •

**کوشتنی عـارف صائب و جەمال عیرفان**

وەك لەمەوپێش وتمان عارف صائبی برای کاکینە لە دێی قەرەچەتان لە مانگی مایسی ١٩٢٣دا بە دەستی خزمێکی شێخ کوژرا ، لە کاتێکدا کە ئەویش هاتبوە دەرەوە لە شار و دابویە پال لەشکری شێخ ، بەلام بەناحەق دلیان لێ‌پیس‌کرد کەوا گوایە ئەیەوێ بگەڕێتەوە و وازبهێنێت • شێخ وەك ئەلێن ئاگای لە کوشتنی نەبووە و کە خەبەرەکەشی بیستووە پێی ناخۆش بوە • ئەوەتا مامۆستا هاوار ئەلێت(٢١) «•• وە نەبێ شـێخ مەحمود بە کوشتنی عارف صائب ڕازی بوبێت ، بەلکو بە پێچـەوانەوە کە هەوالی کوشتنی ئەبیستێ زۆر دلتەنگ ئەبێ و ئەمری کوشتنەوەی ئەو کەسە ئەدا کە عـارف صائبی کوشـتوە و ئەفەرمـوێ : ڕەزا بەگ مـەلا عارف

(٢١) لە (پیرەمێردی‌نەمر)دا . چاپخانەی (العانی) سـالی ١٩٧٠ لاپەڕە (٧٢) .

خۆشەویستم بۆ ، لە هەمو ڕاز و نهێنیم ئاگادارم ئەکرد ، زیرەك و بە جەوهەر بۆ ، خوا حەمە(٢٢) بگرێت ، ئەبێ بکوژرێتەوە» • کەوابۆ شێخ ئاگای لێ نەبوە ، بەلاّم هەرکەس بۆ خۆی بۆ ، خزم و کەسوکار و خۆبەرەپێش (اتتهازی) و چاو لە دوەکان ••• کاروباریان گرتبوە دەست • جا ئەگەر یەکێك برای ئاوا بەخۆڕایی بکوژرێت چۆن ئەوەی لەبیرئەچێتەوە، بەتایبەتێ کە لەوەپێش عارف صائب سکرتێری شێخ و نزیکترین کەس بۆبێت لێوەی ، با ئاگاشی لێ نەبۆبێت کە ئەمە ئەوسا ساغ نەبۆبوەوە ، ئەمە لەلایەك •

لە لایەکیترەوە جەمال عیرفان کە یەکێك بۆ لە منوەرەکان (ڕۆشنبیرەکان)ی ئەوسا و برای حەبیبە خانی ژنی و دوای ئەویش برای حەپسەخانی ژنی ، دیسان لە مانگی کانونی سالّی ١٩٢٣دا کوژرا ، کوشتنەکەی ئەویش هەر درایە پالّ شێخ ، ئیتر ئاگای لێ بۆبێت یان نا ، هەر ئەو لێپرسراوە چونکە لەکاتی دەست ڕۆیشتنی ئەودا بوە • ئەمە لە ماوەی سالێکدا کە (١٩٢٣) بۆ ، دۆ عەزیز و خۆشەویستی کاکینە کوژران ، لە کاتێکدا کە خۆشی ئاوارە و لەگەلّ مالّ و منداڵیا لە غەریبایەتی ئەژیان •

بۆیە من گومانم لەوە نیە کە کوشتنی ئەم دوانە کارێکی زۆری کردۆتە سەر دلّ و دەرونی کاکینە و سەر نوسینەکەشی • هێچگار لەبەر ئەوەی کە بەبێ سوچ و گوناە هەردۆکیان کوژران ، تەنها ئەوە نەبێت کە تێگەیشتو (منور) بۆن • ئەمە جگە لەوەی کە باری ئەوسای سلێمانێ وەك لە چیرۆکەکەدا هاتووە و وەك لە خەلّکی ئەبیستین زیاتر لەوە نەبۆبێت کەمتر نەبوە کە ئەمانەش هەمو (واقع)ێکی تالّ و تفتمان دێنێتە بەرچاو ، هەر ئەو (واقع)ە پڕ ناسۆرەش بۆ کە جارێکیتر و بە جۆرێکیتر هاتەوە کایە و دۆپات بوەوە •

---

(٢٢) مەبەستی شێخ محەمەدی سەیدەبچکۆلەیە .

بەڵام لە سەرێکی تریشەوە نابێ هەرگیز ئەوەمان لەبیربچێت کە شێخی گەورە و مەزن هەڵگری مەشخەڵی ئازادی و ئاڵای نەتەوایەتی بوو ، دژی ئیمپریالیزمی ئینگلیز بوو کە هەتا ئیشیان بە کورد هەبوو لاواندنیان و کە ئیشیان نەما پشتیان تێکرد ، شێخی گەورە زۆر لەم فڕ و فێڵە گەیشت ، بۆیە ڕۆژێك لە ڕۆژان سەری بۆ دانەنەواندن و هەمیشە لە خەباتدا بوو لە دژیان و میللەتی کوردیش بەدوایەوە • کە ئەمەش بوو بەهۆی بڵاو کردنەوەی (وعی سیاسی) لەناو کوردا دژی ئیمپریالیزم •

## ڕوون کردنەوەیەکی خەوەکە

پێش ئەوەی لەگەڵ خەوەکەدا بڕۆین حەزم کرد چەند شتێك بۆ خوێنەری بەڕێز ڕوون کەمەوە :

- تۆستینەکەی (لە خەوما)م لەبەر دەستخەتی کاکینە خۆی تۆستیوەتەوەو تەنها دەسکاری یەکی کەمی ڕێنوسەکەیم کردوەو لە هەندێ شوێنیشدا لەسەر ڕێو شوێنی ڕێنوسی کۆڕی زانیاری کورد ڕۆیشتوم تیایا •

- لە دەست پێکردندا کاکینە ئەڵێ (••• لە دنیادا گیرم خواردوە ، ساحێب کولفەت و منداڵ ، بێپول و پارە و دەست سپی و بێمایە •••) مەبەستی ئەو کاتەیە بە ئاوارەیی لە کەرکوك بوو بێ ئیش و کار لەگەڵ ماڵ و منداڵدا •

- کە ئەڵێ (••• وەختیش ئاخر و ئۆخری پایزە ، سارد و سەرمایە ••) وا تێ ئەگەم مەبەستی پایزی ساڵی ١٩٢٤ بێت • چونکە ئەو ساڵی ١٩٢٣ چوە کەرکوك ، ئەبێ شتێکی پێ بوبێت لە سلێمانییەوە لەگەڵ

خۆیدا بردبێتی ، ئەوەی خەرج کردوە ، لە ساڵی دواییدا کەوتۆتە دەست کورتی •

ـ ئەڵێ ( •• هەڵسام ڕۆم کرد بۆ بەرەوژور وتم وڵاتی ئیسلامە ) مەبەستی لە کەرکوکەوە بەرەو سلێمانی چونە •

ـ ئەڵێ (•• ئەو شەو و ڕۆژە بە ڕەحەتی و بێ قورت و ئەمبەرو ئەوبەر هاتین بەڕێوە هیچ سەغڵەتیمان نەدی ••) کاروانی ئەوسا بە شەو و ڕۆژێك ئنجا لە کەرکوکەوە ئەگەیشتە ناوچەی هەمەوەند • لێرەدا هێشتا نەگەیشتوە بەڵام کە ئەڵێ (••• یاخوا دوشمنی ئیمانت بێ • ئەو ڕۆژە لە سێ چوار لاوە جەردە و ئەشقیا هاتنە سەر ڕێگەکەمان بۆ بە تەق و هۆڕی تفەنگ و شەڕ و هەرا •••) مەبەستی گەیشتنە ناوچەی هەمەوەند و چەتەکانی ئەو ناوەیە •

ـ بە قسەکانی کابرای خانەچی‌دا ، ڕاو و ڕۆتی کاربەدەستان و ئەو کەسانەمان پیشان ئەدا کە خۆیان دابوە پاڵ شێخ •

ـ ئەوسا کە بیان ویستایە یەکێك تێوە بگلێنن ، بە جاسوسیەت گوناهباریان ئەکرد ، سەردەمێك دوای ئەوە بە کوردایەتی ، ئنجا بە نازیەت دوای ئەوە بە شیوعیەت ••••

ـ ئەوانەی کە (وەصف)یان ئەکات ، هەمو کاربەدەستی ئەو دەمە بون ، ئەوانەی لەو کاتەدا ژیابن بە ئاسانی هەمویان ئەناسنەوە کە کێ بون هەروەها ژنەکانیش •

ـ ئەو خانوەی کە باسی ئەکات و ئەمیان تیا بەند کردوە ، خانوەکەی مالی نەقیبە کە بەرامبەری مزگەوتی گەورەیە •

ـ چەند هەڵەیەك لە چیرۆکەکەدا هەیە (وەك باسی سەرما و بەستنی ئاو

ئەکات کە لە دەمە دەمی زستاندا شتی وا ڕۆ نادات) • ئەوانەش شتێکی ئەوتۆ نین لە نرخی کەم بکەنەوە •

کۆتایی بە خەوەکە نەهاتــوە ، واتا چیرۆکەکە تــەواو نەبوە ، بەلاّم مەبەستی هەمۆ داوە بە دەستەوە •

ئنجا فەرمۆ بۆ ناو ڕۆداوی خەوەکە :

**جەمال بابان**

**ئەیلــــۆلی ١٩٧٥**

خوا به خێری بگێرێ :

شەوێك لە خەوما وا لە دنیادا گیرم خواردوە، ساحیب کولفەت‌و مندال، بێ پول‌و بێ پارە ، دەست سپی‌و بێ‌مایە ماومەوە ، زۆر ئەحوالێکی خراپ‌و ناخۆشم هەیە • هەر بیر ئەکەمەوە لەبەرخۆمەوە ئەڵێم ، یا رەببی چی‌بکەم ، چۆن هەوڵێك بدەم شتێکم دەست‌کەوێ ، ئیدارەی خۆم‌و ماڵ‌و منداڵمی پێ رێك‌بخەم‌و لەژێر باری قەرزو نەبوونیدا دەربچم ، هەرچەند سەرم هێناو برد غەیری سەفەر کردن هیچ چارەیەکی‌ترم بۆ خۆم نەدۆزی‌یەوە ، وەختیش ئاخرو ئۆخری پایزە ، ساردو سەرمایە ، زستانیش لەپێشەوەیە ، بەری دوورە ، تأمینی ئیدارەیش لازمە ، بە ناچاری‌و ناعیلاجی کەوتمە سەر خەیالی سەفەر ، لەگەل ماڵ‌و منداڵ تەگبیرمان کردو قرارمان دا کە سەفەرێك بکەم ، بەلکو هیچ نەبێ ئیدارەی ماڵ‌و منداڵەکەم پێك‌بێنم • منداڵەکانم لەو مەملەکەتە بەجێ‌هێشت بۆخوا ، خۆشم ناوی خوام لێ‌هێناو هەڵسام ڕۆم کرد بۆ بەرەو ژۆر وتم وڵاتی ئیسلامە • لەو سەرەوە ئیسلام‌و پیاو چاك زۆرن ، یاریدەی یەکتری ئەدەن ، منیش موسولمانم ئەچم بەلکو لەوێ بە هەر نەوعێك بێت ئیدارەی ئەم زستانەم تأمین بکەم‌و بیهێنمەوە بۆ منداڵەکانم • دو سێ کولیرەم بەستە پشتم‌و شوێن کاروان کەوتم ، ئەو رۆژە بە پیان رۆیشتم ، بەڵام چونکە قەت بە پێ نەرۆیشتبوم زۆر هیلاك‌و ماندو بوم ، لەپاش چەند سەعاتێك هێز لە ئەژنۆم بڕا ، هەرچەندم کردو کۆشام ، توانای هەنگاوێکم نەمابو بینێم بە ڕێدا • پێم هەمو بۆبو بە

بلۆق ، هەناسە بڕکێم پێ کەوتبو ، زمــانم بستێ دەرکێشابو ، هێزی قسە کردنم نەمابو ، روانیم فائدەی نیــە ، ناتوانم بڕۆم بەرێوە ، قەرارەکەشــم قطعیە بۆ ئەم سەفەرە ، هەر ئەبێ بچم ، چونکە چــارەی ترم نیــە ، پولێ پارەیەکیشم پێ‌نیە کە بیدەم بــە کرێی ولاخ • هەرچەند ســەرم هێنــاو سەرم برد هیچ چارەیەکم نەدۆزیەوە ، ئیللا ئەمە نەبێت هاتم لەگەل یەکێك لە کاروانچیەکان خۆم زێك‌خســت ، پیرەمێردێك بو ، چــوار پێنج ولاخی پێ بو خۆشی تەنها بو • وتم مامە تۆ بۆچی نــایەیت تاوتــاوە من ســوار بکەیت‌و مــاندوم بحەسێنیتەوە ، منیش لە رێگاوبــان خزمەتی ولاخەکانت لەگەل ئەکەم‌و لە ئیشەکانتا یاریدەت ئەدەم • کــابراکە پیاوێکی بــاش‌بو وتی هەزار جار مەمنونیش ئەبم • بەورەنگە قەرارمــان داو رێك‌کەوتین‌و بۆ خۆم سواری ولاخێك بوم هاتین بەرێوە •

ئەو شــەوو رۆژە بە رەحەتی‌و بێ‌قۆرت‌و ئەم‌بەرەو ئەو بەر هــاتین بەرێوە ، هیچ سەغلەتیمان نەدی ، لەپــاش شەوو رۆژێــك ئیتر گەیشتینە حدودی ئەو ولاتەی کە بۆی ئەچوین •

یاخوا (دوشمنی ئیمانت بێ) ئــەو رۆژە لە سێ چــوار لاوە جەردەو ئەشقیا هاتنە سەر رێگەکەمان بۆ بە تەق‌و هــوڕی تفەنگ‌و شــەڕو هەرا ، فەقەت کاروانەکەی ئێمە قەلەبالغ بــون‌و هەمو تفەنگیان پێ‌بو • لەبــەر ئەوە جەردەکان هیچیان زۆریان بەسەریاندا نەئەشکاو ئەگەرانەوە • شــەو لە منزل ماینەوە ، سبحەینێ کەوتینە رێ ، یاخوا هەر دوشمنتان بیبینــێ ، لەم پەنــا گردو لەو کوردەرەو شــیو هەر فڕکان فڕکانی تەریدەو جــەردە بو • پۆل بۆل ئەهاتنە ســەر رێگەمــان و قەدرێك شــەرە تفەنگ ئەکراو زەفەریان نەئەبرد ، خۆیــان ون ئەکرد • هەتــا دەمەدەمی عەسر بەم رەنگە رویشتین بەرێوەو منیش چونکە بە عومری خۆم ئەحوالی وام نەدیبو ، زۆر ئەترسام• هەر لەگەل تەقەی تفەنگیك ئەهات وەختەبو رۆحم بچێت ، ئەموت ئەها هەر ئێستا ئەکوژرێم، لەپاشاندا کاروانچیەکان وتیان، ئێمە هەرچیەکمان

کردوه ئەبێ ئەمشەو خۆمان بگەیەنینە ناوشار ، چونکە ئەگەر ئەمشەو لەم ناوەدا بمێنینەوە ، ئەم جەردانە بەیانی چەند تاقمێکیان یەك ئەکەون ، دێنە سەر رێگەکەمان هەرچی خراپە بەسەرمان ئەهێنن • قراریان دا بە هەمویان کە نەوەستن و لێ خوڕن ، ئەو شەوە هەر خۆیان بگەیەننە شار • منیش ئەم قەرارەم زۆر پێ خۆش بو ، چونکە ئەمویست سەعاتێك زوتر بگەمە جێی مقصد و هەمو ئومێدێکم لەوێ پێك بێت و لەم نارەحەتی و ترس و لەرزە نەجاتم ببێت ، لام وابو هەر بگەمە ئەوێ ئیتر نورەی فەرەحی و خۆشیم ئەبێت •

دنیا لەپاش نیوەڕۆوە بو بە هەورو هەللا ، کزەبایەکی زۆر ساردی ئەهات ، جار جار بروسکەو چەخماخەی ئەدا • پاش عەسر تنۆکە تنۆکە دایکردە باران ، ئیمەیش هەر ئەڕۆین ، ئەلێین لەسەر خوا ، هەرچۆنێك بێت هەر بڕۆین چاکە ، خێرا لێمانخوڕی هاتین بەڕێوە ، بارانیش هەتا بێت زیاد ئەکات ، منیش لەسەرمانا وەختە زیڕە بکەم ، شەویش هات بەسەردا تاریك و تۆتەك ، ئەسلی ئەمەیە ئەلێن «تاریکە شەوە گەلالی لەناو(۱)» شەو بو تاریکەو ئەموستەچاو» کەس بەری پێی خۆی نەئەبینی ، ترسو لەرز ، سەرماو باران ، زەندەقدار زەندەقی ئەچو • بارانیش وەکو کوندەی سەرەوژێر دێتە خوارەوە ، کەی کەم ئێستا کەم ، شەستو رەهێلە ، کلاو بەسەر ئەبارێ ، لەملاو لەولاوە ئاو هەلساوە بە باوە ئەم بارانە ئەهێنێ ، ئەیدات بەسەرو چاوی انساندا ، قوڕو چلپاو ، گەردەلولێکە (العیاذ باللە)• منیش ئاو لە تەپلی سەرمەوە دێتە خوارەوە ، لە بەری پێمەوە ئەچۆڕێتەوە • لەرزە لەرزی بەدەنم ، قرچو هوڕی دانم ئەهات ، «دەزوی وشك لە بەدەنما دانم بو (۲)» • هەر خێرا خێرا ئەمپرسی ، زۆرمان ماوە بگەینە شار یان

---

(۱) پەندێکی پێشینانە ، مەبەستی ئەوەیە دزو جەردە لە ناوە .

(۲) ئەمیش هەر پەندێکی پێشینانە ، مەبەستی ئەوەیە هەمو گیانی تەڕە .

نا ؟ ئەیانوت هێشتا ماومانە ، تاوتاو بەو حـاڵەوە لەبەر هیلاکی خەویشم ئەهاتو وەنەوزەکوتیم بـو ، لەپڕێکدا کەرەکە لەژێرما سەرسمێکی ئەدا و گرمها رائەپەڕیمو خەبەرم ئەبوەوە ، نەختێك چـاوم ئەگلۆفتو بە هۆش ئەهاتمەوە • ورده ورده بیریشم لە حاڵی خۆم ئەکردەوە ، چونکە لە عومراتی خۆم سەفەری وا نارەحەتم نەکردبو پەشیمانیم حـاصل کرد • لەم ناوەداو لەو قیامەتەدا دیسانەوە لە دو سـێ جیگەی‌تر جەردە هـاتنە سەر رێگامان کوڕە مەڕۆن روتەوە بن ، کورە نەیەنە پێشـەوە ئەکوژرێن • تەقو تۆقی تفەنگ ، گیزو هوڕی گوللە بە پەنـا گویچکەمانا وەختە بو رۆحم بچێ ، لەترسـانا هەر ئەوەبو زیـڕەم نەئەکرد • ترسو لەرزو دڵەکوتێ ، وەرە بەمحاڵەوە هەر سەعاتە نە سەعاتێك ئەمەیش یەخەت بگرێ ، هەر ئەرۆیشتم ئەموت یارەببی تۆ نەجات دەری نەجات ، کەی ئەگەینە فەرەحیو نەجاتمان ئەبێت • خولاسە ، سەرتان نەیەشێنم سـەعات چـوارو پێنج بەدواوە لـە دورەوە دەنگی سەگ‌وەڕ هات ، وتیان ئەها وا نزیك بوینەوە ، لە دڵی خۆما شایەتمانێکی بە حەقم هێنا و خۆشی کەوتە دڵمەوە ، ئەو لەشە ساردەم لە خۆشیاندا گەرم بوەوە ، زیندوبومـەوە ، ورده ورده هاتین ڕوانیـمان لە دورەوە توروسکەی چرا و ئاگر دەرکەوت ، وتم ئۆخەیش شوکور وا نەجات بۆ ، بەم حاڵەوە هاتین گەیشتینە قەراغ شار ، ئەمجاریش قەدرێ شوکری خوام کرد کە لەو رەزالەت و مصیبەتە نەجاتمان بـو گەیشتینە فەرەحێ •

## گەیشتنە شار و ئەوەڵ قۆرت

سەیرم کرد لەو نیوەشەوەدا ، لە قولغەیەکی قەراخ شار ، سێ کەس بە تفەنگەوە دەرپەڕین وتیان کورە مـەڕۆن بزانین ئێوە کێـن و لەکوێوە هاتون و چیتان پێ هەیە و بۆکوێ ئەچن • وتم ئەمە چێبو ، دەك بەزیادی خێرم نەکرد ، نەخێـر سەیرم کرد پـیرە کاروانیـان خستە حەلـوەلاو شەقوشۆق ، لەمیان ئەداو بەویاندا ئەکوتا ، پەلەماری ئەو باریان ئەدا ،

سەرو پۆتەلاَکی سێ چوارێکیان کوتایەوە ، لەوناوەدا قسەی خۆمان بێ منیش بەر یەك دو شەپازللەی مزر کەوتم ، من هەروا واقم وڕمابو ئەموت ئەمە چێبو ، ئێمە خۆشی خۆشێ ئەوا گەیشـتینە جێی مقصد کەچی ئەم زرمو کوتە چێ بو ؟ وتیان دەی درەنگە بزانـین قاقەزتان چێ پێ هەیـە ، بارتان چی یە ، لە کوێوە یەن ؟ وتیان لە فلاَنە جێگەوە دێ ینو خەلقی فیسارە جێ ین ، بارمان شەکرو چایە ، کاغـەزو ماغەزیشمان هیچ پێ نیـە ، هانێ بمانپشکنن . خۆلاسە لەبەر ئەو بارانو رەهێڵەیە ، نیو سەعات زیاتر بـەم گێرمەو کێشەیەوە بوین ، تاکو کاروانچیەکان سەری خۆیان قەبلاَند ، یەکی شتێك پارەیان بۆ گرد کردنەوە ، ئەمجار رێی نەجاتیان پێ نیشاندان ، لە پاشان دوان لەو باجگرانە هاتن بەلای منەوە ، لەو تاریکاییەدا ، سەیرێکی سەرو سەکوتو قـەدو قیافەتی منیان کـرد ، لێم مۆڕ بونەوە ، ئەمجـار یەکێکیان شخارتەیەکی داگیرساندو تەماشایەکی کرد وتی ئەمە چیە ، کێ یە ، لەکوێوە هاتوە ، بۆ کوێ ئەچێ ؟ . کـابرای کاروانچی وتی ئەمە پیاوێکی غەریبە ، لەو گەرمیانەوە هاتوە لێرە کاسبی بکا ، فەقـیرە ، بێدەسەلاَتە ، وتیان نابێ هەڵبەت ئەمە شتێکی لەژێر سەردا هەیە ، هەبێتو نەبێت ئەمە جاسوسە ، بە فێڵو تەڵەکە خۆی وا لێ کردوە ، ئەوانیش وتیان کورە نە بەخوا جاسوسی چی ، فەقیرو غەریبە هاتوە لێرە کاسبیەك بکات بۆ خۆیو چەند پارەیەك بۆماڵو منداڵی پێکەوە بنێ . نەخێر کاروانچیەکان زۆریان وتو ئەوان کەمیان بیست ، هاتنە پێشەوە لێـم ، دەوریاندام ، هەمـو لەشمیان پشکنی ، سەرو کلاَویان داماڵیم ، تمە لیتەکیان سەنگو سـوژن دا ، زۆر ئەملاولایان کرد هیچ نەبو ، منیـش خۆ کە ناوی جاسوسیم بیست هـەر حەپەسامو تاسام ، هیچ قسەم پێ نەکرا هەروا واقم وڕمابـو ، قەدرێکـی باش بەم رەنگە چەرمەسەرێیان دام ، هیچیان نەدۆزیەوە . ئەمجار دوانیان لاپەڕیان لێ گرتین ، نەختێ سـرپو هوڕیان کردو هاتنەوە نزیـك ئێمە ، کابرای کاروانچیان بانگ کردە لاوە ، لەگەڵ ئەویش قەدرێك چرپە چرپیان

کرد ، کابرایەکیش هات بەلای منـــەوە وتی باوکم ئەمانە بەهیـــوای ئەوەن شتێکیان بدرێـــتێ ، منیش سوێندم بۆ خـــواردن کە تۆ لە هیچـــا نیتو هیچیشت نیە بیاندەیتێ فەقەت ئەوان هەر دەست هەڵناگرن‌و چۆن لەژێر چنگی ئەم بەدبەختانە دەرت‌بێنین ، منیش تێگەیشتم کە ئیشەکە نارەحەتەو ئەمانە تەشقەڵە ئەکەن ، یان ئەبێ شتێکیان بدرێتێ یان ئێمە بە قەڵبەیەکدا ئەدەن‌و منیش کێچ لە باخەڵمدا بۆ پولێك سەوزەڵە گیانم ئەڵێ • هەرچەند سەرم هێنا و سەرم برد چارەسەرێکم بۆ خۆم نەدۆزیەوە ، وتم فلانی تـــۆ خۆت ئەزانی کە من هیچـــم نیە بیاندەمێ و خۆمان لە شەڕیـــان لادەین و ئاگاشم لەم شتانە نیە کە ئەوان ئەیلێن ، جا کەیفی خۆیانە رەزام بە قەزای خوا دەسەلاتم چیە • کابـــرای کاروانچێ ئەمجـــاریش لەگەڵ هاوڕێکانی چۆنەوە بە لایانـــەوە ، قەدەرێکیان لەگەڵ وتن و ڕستیان هـــەر ئەیان‌وت فائدەی نیە ، منیش بەجارێك سەری دنیام لێ هاتبوەوە یەك ئەموت یاڕەبی چی بکەم ، بۆ ڕیش هاتم سمێڵیشم نایە بان ، لەو تەنگ و چەڵەمەیەدا هیچ ڕێگایەکم بۆ خۆم نەئەدۆزیەوە • دوایێ کابرای کاروانچێ وتی باوکم خوا هەڵناگرێ ئێوە سەعاتێ زیاترە ، بەم تاریکە و سەرما و لێزمەیە ، ئێمەتان لەم قوڕەدا ڕاگرتوە ، ئێمە وا ئەچینە فلانە خان ئێوە بەیانێ وەرنە ئەوێ ، سا لەوێ بەلـــکـــو شتێ بە شتێـــك بکەین • بەم ڕەنـــگە ئەوانیش دەست بەرداربون و بەرایی کاروانەکەیان بەردا ، ، ئێمەش لێمان خوڕی و چوینە ناو شارەوە ، ئەما من لەم سەفـــەرە زۆر پەشیمان بومەوە ، دلـــم گیرابو ، مأیوس بوم وتم ئەمە ئەوەلی بێت ، ئاخۆ ئاخری چۆن ئەبێ • لەو سەعاتەوە کە هاتبومە دەرەوە لە ماڵی خۆم هەتا ئەو دەقیقەیە بیرم لێ‌کردەوە و من لەو دو سێ ڕۆژەدا چەنـــدم مەرارەت بە سەرا هات و چەنـــد نەوعە ئەزێت و مصیبەتم دی ، چارەیشم هیچ نەبو ، نە ڕێی ڕاکردنم بو ، نەتوانای گەڕانەوە، هەر ئەمەندەم بۆ مابوەوە ئەموت خوا چاکی بکات ، بزانین ناو چاوانم چی لێ نوسراوە ، بەمانەیش ببڕێتەوە هەرچاکە ، خوا خراپتر نەدا ، وردە وردە

هەر ئەڕۆم ئەم خەیالاٌنە ئەکەم ، ڕۆیشتین هەتا بە هەر حاڵێك بۆ گەیشتینە خانەکە و دەرگایان لێ‌کردینەوە و چۆینە ژورەوە ، سەرما ، قوڕ ، دڵۆپە ، بێ ئاگری ، لەرزێکیش چۆبوە ناو سکمەوە زۆرم سەرمابو ، هەمۆ لەشم بە جارێك داهێزرابۆ ، تێك‌شکابو ، هیلاك ، ماندۆ ، مردۆ ، خەوم یەت ، برسیمە ، نەخۆشم ، هەر نازانم بڵێم چی •

## ئەحواڵی خان و دۆەمین قۆرت

بە هەر حاڵێ بۆ ، لە قوژبنێکی ژۆرەکە بە توروسکەی چرای قوتیلکەی خانچیەکە بستێ جێگای وشکم دۆزیەوە ، لەسەر تا جەواڵێکی کاروانچیەکان بە چیچکانەوە هەڵتوروشکام و سەرم نایە سەر ئەژنۆم • لە ئەوەڵی عومرمەوە هەتا ئەو دقیقەیە پەڕە پەڕە تأریخی ژیانی خۆم خوێندەوە کە لە دنیادا من بە أمل و هیوای چی ژیاوم و ئێستا چ ڕۆژ و سەعاتێکم دی ، زۆر زۆر مأیوس بۆم دڵم پڕ بۆ لە خوێناو ، بەو ڕەنگە هەتا نزیکی سەعاتێك ڕام‌بوارد ، کابراکانیش کەر و باری خۆیان دامەزراند ، هەریەکە لە سوچێکەوە لاڵ و پاڵ لێی کەوتن ، پرخ و هوڕی خەویان لێ‌هەڵسا • گوێم گرت لەو نزیکانەوە لە ماڵێك دەنگی شیوەن و گریان و لاواندنەوە و کوڕۆزانەوە یەت ئەممما چۆن دەنگێ ، هەروا بەردی ئەتوانەوە ، هەروەکو بهێنی ساجێك ژیلەمۆ بکەیتە جەرگمەوە ئاگرم تێ‌بەربۆ ، خۆم لەبیر چوەوە ، بێ‌پەروا وەکو شێت ڕاپەڕیم چۆمە دەرەوە، لە خانچیەکەم پرسی وتم ئەم شیوەن و گریانە چیە ؟ وتی ئەوە هیچێکی وانیە ئەو ژن و مندالاٌنە مێرد و باوکیان کوژراوە • کابرای تاین بە ڕەنگێ وا بێ أهمیتانە وتی «ئەوە هیچ نیە» کە من لە جێگەی خۆم هەر وشك بۆم ، مەگەر من شتی وا ئەوەڵجارە ئەبینم و کابرایش ئەم نەوعە شتانەی زۆر دیوە ، ڕاهاتوە و ئەمانە هەر بە هیچ ئەزانێ ، منیش قەدەرێ ڕامام و لەبەر ئەو سەرما و بارانە گوێم لەو گریان و کڕۆزانەوەیە گرت و چەند

فرمێسکی حەسرتم هەڵڕشت ، دوایی وتم یاڕەببی تۆ خەبیر و قادری چیبکەم و من چیم لە دەست یەت ، هەروا بە هەناسەی ساردەوە گەڕامەوە ژوورەکە و دانیشتم هەر تاس ئەیبردمــەوە ، قەدرێــکی باش بەو ماتــەمینیەوە سەرم نایەوە ، هیچ فائدەی نەبو ، لە تاوانا هیچ خەویشم لێ نەئەکەوت • هەر ئەوەندەم زانی لەو دیو خانەکەوە تەقەی تفەنگ و هەرا و زەنا و زریکە و هاوار پەیدابو ، چەند تەقەیەك هات ، بو بە غەڵبەغەڵب و گریان و شیوەن و بانگە بانگ ، دیسانەوە خۆم نەگرت دەرپەڕیمە دەرەوە گوێم گرت ، هەر ژن و منداڵبون لەو دیوەوە بــە گریانەوە قسەیان ئەکــرد ، ئەپاڕانەوە و ئەلالانەوە ، ئەمجاریش لە خانچیەکەم پرسی وتم ئاخۆ ئەمە چیە ، ئەمجارە چیبوە ؟ وتی چوزانم پیاو ئەگەر من بۆ ئەمانە جوابی تۆ بدەمەوە ئــەبێ خەریکی هیچیتر نەبم هەر جەوابت بدەمەوە ، شەو و ڕۆژی سەد شتی وا لێرە ئەقەومێ ، وتم ئاخر خاڵۆ تۆ عاجز مەبە انسان لەمانە دڵی ئەبێ بە ئاو ، چۆن ناپرسێ ، وتی ئاخــر تۆ شتی وات نەدیوە بۆیە وا بۆ هەمــو شتێك ئەپرسی ، هێشتا ڕانەهاتویت ، ئەوە ساحێبی ئەم ماڵە نازانم چەند ڕۆژێکە لەسەر جاسوسێ و ماسوسێ گیراوە و فەلاقەیەکی زۆر کراوە و لە پاشان داوای جەزایەکی زۆریان لێکردوە ، ئەویش پارەی نەبوە بیدا ماڵەکەیان فرۆشتوە ، ئەویش بەشی جەزاکەی نەکرد ، ئێستاش خۆی هەروا حەپسە ، کەچی ئەوا فەقیرە دز هاتۆتە سەر ماڵەکەشی ئەو تۆزە پڕ و پیتەیشیان کە ماوە هەڵبەت بردویانە ، وا تفەنگیشیان پێوە ئەنێن ، ئێستــا منداڵێکیشی نەکوژرابێت هەر چاکە • وتم ئەرێ ئەم هەمو جاسوسە چیــە لێرە هەیە ؟ کابرای خانچێ سەرێکی لێ لەقانــدم و سەیرێکی فصاڵی کــردم و تۆزێك پێکەنی وتی : ئای باوکم ئەمە نەخۆشیەکە هەمو کەس ئەبێ بیگرێ ، تــۆ غەریبی هێشتا ئەمەت نەدیوە ، بەڵام چاوت نەفــڕێ تۆیش ئەیبینی • ئیتر منیش بە مات و مەلولی هاتمە ژورەوە و سەرم نایەوە لێی کەوتم فەقەت هیچ خەوم نەبو ، ئەحواڵێکی زۆر خراپ و ناڕەحەتم بو ، لە سەرمانا هەڵ

ئەچۆقێم • برسی ، دڵگیراو ، عاجـز ، مات ، هەر بیرم لە خـۆم و لە دنیا ئەکردەوە ، هەر سەعاتە نە سەعاتێکیش لەم لاو لەو لاوە تەقوهۆڕی تفەنگ ، هاوار و بانگی خەڵق ئەهات ، منیش لە تاوانا ڕائەچەنیم ، فەقەت نەم ئەتوانی بچمە دەرەوە ، هەر چۆنێك بۆ بەو حاڵە ڕامبوارد هەتا بەیانێ •

## ڕۆژەوەبۆن و قۆرتی سێیەمین

بەیانێ لە تاریکە و لێڵەدا بۆ هێشتا ، گوێم گرت لـە دەرگایاندا ، دەرگا کرایەوە ، ڕوانیم سێ زەبەللاح بە تفەنگەوە هەڵیانکوتایە ژوورەوە ، وتیان کوانێ کابرای جاسوسەکە ، مامەی کاروانچێ منی نیشان دان وتی : ئەوەتە ، باوکم ئێوە بۆچی انصاف و ڕەحمتان نیە ، ئەم فەقـیرە غەریبە و هیچی لێ هەڵناسێ و سوێندی مغلظەتان بۆ ئەخۆم ئاگای لە هیچ نیە ، لەتاو دەردی نەبونی و کەمدەستی خۆی کوتاوە بۆ ئێرە ، ئێستا بێ دەسەڵات و بێ پارەیە ، ناتوانێ سەری خۆی بقەبلێنێ و خزمەتێکی ئێوە بکات ، ئەوا لێرە خەریك ئـەبێ ، ئەگـەر بۆی هەڵبسـوڕێ ئیشێ ، کـارێ ئەگرێ بەدەستەوە ، لەمەودوا لە بەردەستی خۆتاندا ئەبێ ، ئەتوانن هەمۆ وەختێ بە هەوەسی خۆتـان بیڕوتێننەوە و لەبـەرەوە حەقی ئەم چـاکەیەتان بۆ بکاتەوە • کابرای کاروانچی بەم قسە مێچکە مێچـکانە گەلێکیان لەگەڵ خەریك بۆ ، زۆریان بە دەور و پشتا هات لە ئاخری هەمۆ شتێکدا وتیان ئێمە ناتوانین وازی لێ بێنین ، ئەم خەبەرە ئاخری ئەگاتەوە جێی خۆی ، دوایی ئێمە تۆشی مصیبت و بەڵا ئەبین ، کەوابو ئێمە خۆمان بۆچی تۆش بکەین ، هەر ئەبێ بیبەین لەگەڵ خۆمان • کاروانچیەکانیش وتیان ئاخر ئەوا ئێوە ئەم فقیرەتان برد و کردتان بە کوڵـکی مصیبت و ئەزیت و لێدان و گرتن و ئەمانەوە چی بە ئێوە ئەبڕێ • نەوەڵڵا کەوابو خوا هەڵنـاگرێ ، ڕەحمی پێ بکەن وازی لێبێنن ، هەزارتان بۆ دنیا کردوە ، ئەمەش بۆ خوا بکەن • ئەمە بەم گێرەو کێشەیەوە بوین هەتا نزیکی هەتاو کەوتن ، خـوا

کاریان ڕاست بێنێ ئەو کاروانچیانە بە دەور و پشتی ئەوانەدا هاتن و تەفرەیان دان ، بەڵام بێ فائدە بۆ ، ئەوان هەتا ئەهات شێت گیرتر ئەبۆن و ئاگریان ئەگرت ، ئاخری یەکێکیان وەکو هار پەلاماری منی داو قۆناغە تفەنگێکی کێشا بە کورتە کەلەکەما وتی : هەڵسە با بڕۆین ، تەماتە بـەم گێلە گێلەو خاوە خاوە هاتوی لێرە جاسوسی بکەیت • هەستە با بڕۆین ئێستا من ئەزانم چیت بەسەر ئەهێنم • کورە وتم پیاوی چاك بن رەحمـو موسوڵمانەتیتان بێ ، بەخوا هیچم بەبەرەوە نیە ، ئەمـە چەند ڕۆژە بەم بـاران و سەرمایە هاتوم بە ڕێدا ، هیلاك و برسی و نەخۆش و غەریب ، خوا قبوڵی نیە وازم لێبێنن و ئەزێتم مەدەن • هەر ئەوەندەم زانی یەکێکیتریان لەپشتەوە زرمو هوڕ دامیە بەر پێلەقە و شـەپازللە وتی : یاڵـلاّ پێشمان کەوە ، وائەزانێ سەری دنیا بە پوش گیراوە ، ئەوی‌تریشیان لێم هاتە پێشەوە بە پاڵە پەستۆ بە هەرسێکیان دایانگرتم (عەیب نەبێ) بە شەق و زللە و لێدان و سەر و سەکوت کوتاندنەوە پێش خۆیـان دام ، ئیتر هەرچەنـد کاروانچیەکان پاڕانەوە و لاڵانەوە و هەوڵ و تەقەلایان دا و دەخالەتیان پێ کردن ، بێ فائدە بو ، پارەی نەکرد و رایان فڕاندم بۆ کۆڵان ، هـەروا بە کۆڵان و بازاڕدا هێنامیان بەڕێوە ، خلق و خوا هەروا تەماشایان ئەکـردین ، بعضێ کەس ئەمڕوانی بەزەیی بە منـا ئەهات لەبەرخۆیەوە پرتەو بۆڵەیـەکی ئەکرد ، بعضێك کەسی‌تر پێم پێ‌ئەکەنین ، ئەیانوت ئەمـە جاسوسـە با بیخـوا تەماشام ئەکرد لە ناو شاردا بعضێك قیافەتم ئەبینێ هەروا انسان زراوی لێ ئەتۆقی ، هەریەکە دە دوانزە چەفتەو مشکی‌و جامانەی رەنگاو رەنـگیان تێك‌ئاڵاندوەو بەسەریانەوە بەستوە هەریەکە بەقەدەر بەرداشێ ، چوار ریزو پێنج ریز فیشەکیـان لەخۆیان دابو ، خەنجـەرو دەمانچەیـان کردبو بـە قەدیانا ، هـەروا خوێن لەناوچـەوانیان ئەبـاری • تۆشی ئێمـە بـۆن ئەیانوت ئەمەیش رەنـگە جـاسوس بێ ، ملۆزمەکـانی منیش ئەیانوت بەڵێ جاسوسە ، منیش لە دڵی خۆما وتم نەخێـر نەخۆشیـەکەی کابرای

خانچیەکە وتی منیش گرتمو رابورد • هەروا بەم ڕەنگە ئەڕۆیشتین دنیاش زۆر ساردو سەرما بو ، هەورو هەڵلا بە باوە پروشەی ئەکرد العیــاذ بالله ، سەیرم کرد لە کوڵاتێکدا گەیشتین بە ژنێــك خۆیو دوّ منــداڵی ڕەشو ڕوتی پێخاوس سەرقوتین لەوبەر ســەرماو قوڕەدا بــە گریانو شــیوەن ئەکڕوزێنەوە و ئەپاڕێنــەوە ، ئەلالینەوەو هەڵئــەچۆقن ، ژنــەکە پەلی منداڵەکانی گرتبو هەرسێکیان ئەگریان وەك بەلاڵوك فرمێسك بەچاویانــا ئەهاتە خوارەوە ، کە چاوم بەوانە کەوت و ئەو ئەحواڵەم دی بەجارێــك خۆمم لەبیرچوەوە وتم ئاخۆ ئەم قوڕ بەسەرانە چیان لێ قەومابێ ، نەمزانی منیش حەپسم و مڵــۆزمم بەدواوەیــە ، بێ اختیار لە ژنــەکەم پرسی وتم خوشکەلێ ئەوە چیــت لێ قەوماوە وائــەگریت • هەر ئەوەنــدەم زانی لەپشتەوە کابراکان زرمو هوڕ دایانمە بەر شەپازللەو قۆناغە تفەنگ ، وتیان تۆ دەخلت چیە بەسەرەوە ، هەرچی هەیەو نیە ، تۆ بۆچی ئەپرسیت • یەکێك لە زەلامەکان بە ڕقو گاڵتەوە وتی ئەوە چیە • ئەوە مێردەکەی لەم بەینەدا لەشەڕی فلانە جێگە عەسکەر بوە کوژراوە ، ئێستا ئەمانە کەسیان نەماوەو هیچیان نیە ، شێت بوون داوای معاشو ادارە ئەکەن وائەزانن پارە ڕژاوە ، لە دڵی خۆما وتم بەخوا باشە ، مێردو ماڵی بڕوا ، بەم ڕەنگە داوای معاش بکاو تۆیش وا بە گاڵتەوە جوابم بدەیتەوە ، هەڵبەت لەو جێگەیەش کە داوای معاشی کــردوە ، زۆر باشو بــە دڵی خۆیشی بە ڕێ خراوە ، بۆیــە وا بەپێکەنینو کەیفخۆشی گەڕاوەتەوە ، زۆر زەریفە ، بە هەناسەی ساردەوە نەختێکیتر ڕۆیشتین گەیشتینە مەیدانێــك لەوێ سەیرم کرد سێدارەیەك هەڵخراوە لە ژوور ئەویشەوە سێ چوار داریتر پێکەوە داچەقاوەو پیاوێکیان پێوە بەستۆتەوە ، بەو سەرماو بەفرو بارانە چەند کەس دەوریان گرتوە ، ڕوتو قوتیــان کردۆتەوە ، بەتۆی کراسو دەرپێ ، زەلامێکی بێ انصاف بەدارێکەوە وەستاوە لەو قوڕبەسەرە ئەدات • ئەمما چۆن لێداتێك ، زرمو هوڕی دارەکانی ئەمپــەڕوپەڕی ئەو مەیدانە ئەگرێتــەوە ، کابراش هاوار

ئەکاو ئەپارێتەوەو ئەلالێتەوەو خواو پێغەمبەر ئەهێنێتە رجا ، ئەزریکێنێو ئەقیژێنێو ئەویش هەر لێی ئەداو گوێ ناداتێ ، کە ئەوەم دی هەمو لەشم هاتە لەرزینو دڵم داخورپا ، هێزو هەناوم لێبڕا وشك بوم لە جێگای خۆم ، پێی ڕۆیشتنم نەما ، ڕەق ڕاوەستام • یەکێك لە ملۆزمەکان تێیخوڕیم وتی ئەوە بۆچی ڕاوەستاوی ، وابزانم ئەمەت پێخۆشە سەیری بکەیت ، چاوت نەفرێ تۆیش بە خزمەتی ئەگەی ، ئەمیش وەکو تۆ لەسەر جاسوسی گیراوە ، وا داری تێئەبڕن ، منیش هیچ هۆشو شعورم نەمابو کە جوابی بدەمەوە ، لە عەزرەتانا هەروا وشك وەستابوم ، آخری پەلیان ڕاکێشامو ڕایان فڕاندم سەرەوژور پێش خۆیاندام ، ئیتر منیش نە دڵم مابو نە چاو تا بزانم بۆ کوێ ئەچین ، هەروا بەو کۆلانانەدا تێیان پەڕاندم هەمو دارو بەرد بۆنی خوێنیان لێ ئەهات ، بەجارێ ڕۆحم چو ، ئەوەندەم نەزانی گەیشتینە بەر دەرگایەکی گەورە ، قەڵەبالغێکی زۆری لێ وەستابو ، هەر مەڕۆ مەڕۆ و نابێ نابێ بو ، کەسیان نەئەهێشت بچێتە ژورەوە ، ملۆزمەکانی لەمەڕ من وتیان ئەمە جاسوسە ئەمشەو نیوەشەو گرتومانەو هێناومانە ئەبێ بیبەینە ژورەوە ، ئەوانیش وتیان جارێ نەختێ ڕاوەستن ، ئێستا ئیشی خصوصیو مهم هەیە نابێ کەس بچێتە ژورەوە ، قەدرێ ڕاوەستن • هەر کەسێکیتریش ئەهات هەروا ڕایانئەگرت ، نزیکەی سەعاتێك ئێمەیان لەوبەر سەرماو بارانە ڕاوەستاند ، خەلقێکی زۆر لەوێدا گردبونەوە ، هەروا بعضێك لەوانە کە ئەهاتن ڕایان ئەوەستاندن لچێکیان هەڵئەقولتاندو لەبەر خۆیانەوە ئەیانوت ئەها هەر ئەم جارە ئیشی مهمو خصوصی نەبو ، دوایی سەیرم کرد یەکێك لە دورەوە بە کەشو فشێکەوە دە دوانزە کەس بەشوێنیەوە تفەنگ بەدەست ، فیشەکلغ لە پشت ، خەنجەرو دەمانچە بەقەد ، سەرزل سەرزل ، کابراکە خۆی دانەکانی هەمو ئاڵتون بون ، وردە وردە هاتە پێشەوە ، خەلکەکە هەرچی دانیشتبون بەجارێك ڕاستەوە بون • خۆتان لادەن ، خۆتان لادەن پەیدابو ، کە نزیك کەوتەوە منیشیان هەستاندە سەرپیان

وتیان راوەستە بەپێوە ، منیش لەتاواندا بە لەرزە لەرز هەستام‌و ڕاوەستام • کابراکە کە هاتە پێشەوە بە کبرو غرورێکەوە ، بە چەناگە نیوە سەلامێکی کردو زۆ سەیرێکی منی کرد ، وتی ئەمە چیە ، ملۆزمەکانم سـنگیان نایـە پێشەوە وتیان قوربان ئەمە جاسوسە ، ئەمشەو گرتومانـە ، وا هێناومانە ، کابراکە ئەمجار بە غەزەبەوە تێم مـۆڕ بوەوەو پرسی ، لەکوێـوە هاتوە • یەکێك لە ملۆزمەکان چوە پێشەوە بە سرپە دۆ سێ قسـەی لەگەڵ کرد ، ئەویش سەرێکی بۆ لەقاند وتی ئێی ، کەواتە بیهێننە ژورەوە • ئەو تێپەڕی چوە ژورەوە ، دوایی پـەلی منیشیان گرت‌و ڕایان‌کێشام بـۆ ژورەوە ، حەوشەیێکی گەورەو ئاوەدان ، باخ‌و حەوزو باڵەخانەیێکی خۆش • هەروا بردمیان هەتا بەر بیناو باڵاخانەکە ، لەوێ بە چەند پلیکانەیـەکدا سەریان خستم ، ڕاڕەوێك بو سیخناخ بو لـە تفەنگچی‌و زەلامی غەریب‌و عەجیب کە انسان هەر لە چاو پێ‌کەوتنیان زراوی ئەتۆقی ، قەدرێك لەوێ ڕایان‌گرتم لەپاشان ملۆزمەکان دامیانە دەست دۆ سێ تۆبەتچی‌و زەبەللاح خۆیان ملیان شکاندو ڕۆیشتن منیش لە قوژبنێکەوە هەڵتوتام بۆ خۆم سەرم کز گرت لەبەر باری خوادا چاوەڕوانی قەزاو قەدەر بوم وتم بزانم چی‌تریش ئەبینم ، ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە بەوڕەنگە لەو سوچەدا بۆخـۆم هەڵتروشکام ، نە نانێك نە ئاوێك ، نە لێ‌پرسینەوە ، هیچ نەبو ••••• ئەم زەلام بەو زەلامی ئەسپاردم ، لە سـەد کەس زیاتر هاتـون پرسیویانە ئەمـە چیە ؟ وتویانە جاسوسە ، بعضـێکیان بە غەزەبێـکەوە لێم مۆڕ ئەبـونەوەو لێم ئەهاتنە پێشەوە • ئەم‌وت ئێستا هەڵم‌ئەلوشن‌و بعضێکیشیان بـە نیوە پێکەنینەوە لێم ورد ئەبونەوەو بە تأثرەوە ڕویان وەرئەگێڕا •

وەرە سێ چوار ڕۆژ بەم سـەرما سەهەندەیە بە هیـلاکی بەڕێگەوە وەرە ، شەو بەو ڕەنگە بە برسیەتی‌و بێ‌خەوی ڕابوێرە ، بەیانی بەو حاڵەوە بتهێنن بۆ ئەو جێگایە ، هەر سەعاتی مردنێك ببینە ، ئەو ڕۆژەش وا بێ‌زادو ئاو دانێن ، ئنجا سەیری ڕەنگ‌و ڕۆم بکەن ، ئەبێ چیم لێ‌هاتبێ ، چاکە

لەبرسانا هەروا گیـانە گوینەیەکم تیا مابو ، کە ئەجولامەوە هەمـو لەشم ئەلەرزی • وەختی پاش نانخـواردن کە شەوی بەسەراهات یەکێـك لەو خزمەتکارانە وتی : خۆ ئەمە گاورسانی نیە ئەم فەقیرە لە بەیانیەوە بێ نانو بێ ئاو لێرە حبس کراوە ، خوا هەلناگرێ هەر لەخۆیەوە لەو پاشماوانە چەند پارچە نانێکی دامێو کاسەیەك ئاویشی لەلاوە دانام • وتی : ئەوە بخۆ ، منیش وەکو هار پەلامارم دایە ، نـانەکەم خواردو چەند قومێك ئاوم کرد بەسەرا ، تۆزێك زیندو بومەوە ، هۆشێکم هاتەوە بەبەرا • ئیتر کەسێك لە منی نەپرسیەوە • هەر ئەموت ئاخۆ کەی منیان بیر بکەوێتەوەو نەجـاتم بدەن ، بەرەللام بکەنو بۆخۆم بچمە دەرەوە • لە دلی خۆما وتم شەرتم ئەمەبێ ، سەعاتێك لە دەست ئەم دەعبایانە نەجاتم ببێت ئەو ڕێگەیەی کە بیگرمە بەر ئیتر ئاوڕ نەدەمەوەو سەری خـۆم لەم ولاتە خوێناوییـە زالمە دەرکەمو دەقیقەیەك لەو ولاتـە کاولەدا نەمێنم ، بەلام جـارێ خۆ هیچ لێپرسینەوە نیە • لەپاش قەدرێ ڕوانیم یەکێك بە عظمتو جبروتێکەوە هاتە ژاژەوەکە ، خەلکەکە هەمو هەستانو ڕاوەستانو أشارەتی منیشیان کرد ، منیش بە نیخەنیخ هەلسامو بەپێوە ڕاوەستام سەیرمکرد هەروا هاتو وردە وردە بەناو خەلقەکەدا بەپشمو غەزەبێکەوە بە خەلکەکەیـدا هەلڕوانی • ئەمجار چاوی بە من کەوت ، وتی ئەمە چیە ، ئەم دەعبایە کێیـە ، وتیان : قوربان ئەمە جاسوسەکەیە کە بەیانی هێناویانە ، وتی : ئەی بۆچی بە منیان نەوتوە • ئا فلانەکەس بانگ کەن • کابرای کە سەر لە بەیانی لەدەرگای حەوشە هاتو منی لەگەل خـۆی هێنایە ژورەوە بانگ کـرا ، ئەویش بە ڕاکردن هاتە پێشەوە ، وتی : چی ئەفەرموی قوربان ؟ وتی : ئەم جاسوسە چیەو لە بەیانیەوە هێناوتانە بۆچی بە منتان نەوتوە • وتی قوربـان سەر لە بەیانی عەرزم کردی مشغول بویت فەرموت جارێ ڕاوەستە ، وەختی پاش قاوەلتی ئەوەبو دیسانەوە عەرزم کردیتەوە ، فەرموت ئێستا نا • عەصریش کە عەرزم کردیت کەچی تورە بویت ، ئێوارە هـاتم عـەرزت بکەمەوە ،

میوانت هات ئێستاش خەریك بۆم بێمەوە عـەرزت بکەمەوە • ئەمە زۆر مهمە وەکو ئەوانی‌تر نیە • ئەویش چاوی قوچانـدو دەستێکی برد نای بە ناوچاوانیەوە ، قەدرێـکی چاك رامـا ، منیش هەروا بە تـرس‌و لەرزەوە تەماشای ئەکەم‌و ئەڵێم رەنگە ئێستا بیر لە أحوالی بێ‌دەسەڵاتی‌و بێ‌گوناحی من بکاتەوەو بەزەیی پێما بێتەوەو هەر ئێستا ئەمر بـکات بەرەڵڵام کەن‌و رەنگە دڵنەواییشم بکەن بە خوا • کەچی هەر ئەوەندەم زانی سەری بـەرز کردەوەو هەردو چاوی دەرپەڕی ، وتی : ڕاست ئەکەن بە قەبـری باوکم ئەمە زۆر دەهشەتە ، ئادەی بیخەنە ئەو ژوورە زۆر چاك ئاگاتان لێ بێ هەتا بانگی ئەکەم‌و لێی ئەپرسمەوە • ئەرێ گەڕان ، ئەمە هیچ قاقەزو ماقەزی پێ نەبو • کابرا وتی : نەخێر قاقەزیان پێ نەدیوە ، هەڵبەت شاردویەتیەوە ، لە تحقیقاتدا ئەمانە دەرئەکەون ، ئەویش وتی : وایە ڕاستە ، دەبیبەن بۆ ئەو ژورە ، منیـش لەجێی خـۆم هەروا وشـك بـوم ، زوبانم بەسـترا • حەپەسام • ئەوەنـدەم زانی دۆ زرتەبۆز نەوینە پەلم‌و بردمیـانە ژورێکی گەورەو تاریك لەوێ دایان‌نـام‌و دەرگای ژورەکەیان لەســەر داخستم‌و بەتەنها بەجێیان‌هێشتم •

## چیم بینی لەو ژورەدا ؟

لەپاش بەینێك منیش هۆشێکم هاتەوە بەخۆمـا ، سەیرێکی ژورەکەم کرد وتم بزانم ئەم ژورە چ ژورێکە ، ئەمە ئاخۆ زیندانە ، حبسخـانەیە ، چیە ؟ ڕێی ڕاکردن‌و سەردەرکردنی هەیە یان نا ؟ چونکە لە دڵی خۆما وتم من وا تۆشی ئەم دەعبا بێ‌انصافانە بوم هەتـا ممکن بێ چارەسەرێکی خۆم بکەم‌و خۆم دەرکەم‌و نجـاتم بێ ، لای خـۆی من بۆ ڕیش هـاتم کەچی سمێلیشم نایە بان • ڕوانیم لەلای ڕاسـتی ژورەکە بە بـەرزەوە دۆ سـێ پەنجەرەی بچوك هەیە ، شەوق‌و ڕوناکی چرای لێوە دیارە ، بەڵام چونکە پەنجەرەکان لە بـەرزی بون ، چاوم لە هیـچ نەبو ، لەودیـوەوە دەنگە

دەنگێکی زۆری لێ ئەهات • هەمۆشی دەنگی ژن بو ئەهات ، هەریەکە لە ئاوازێك لێ ئەدا و قسە ئەکات • بەتەواوی گوێم لە هەمۆ قسەکان بو ، لای چەپی ژۆرەکەیش دۆ پەنجەرەی گەورە هەبو ، ئەودیوی هەمـۆ قەنەفەو کورسی جوانی لێ دانرابو • ژۆرەکە ڕازابوەوە ، ژۆرێکی ڕێكو پێك بەڵام چۆڵو هۆڵ کەسی لێ نەبو ، چرایشی لێ ئەسۆتا ، منیش قەدرێـك رامام وتم : یاربی چی بکەم من چیم کرد بە خۆم ، ئەمانە چـین ئەیانبینم ، مـن لەکوێو ئەمانە لەکوێ ، ئاخۆ ئێستا ماڵو مندالم لە چیا بنو بەتەمای چی من بن ! ! من لەبەرچی وەکو شێت ماڵو مندالی خۆم بێکەسو بێدەر ، بێ ادارەو گوزەران بەجێهێشتو هاتمە ناو ئەم ئاگربارانە ، زۆر دلم بە حالی خۆمو مـاڵو منداڵەکەم سوتا ، چەنـد فرمێسکێکی گەرم بەچـاوما هاتە خوارەوەو هەناسەیەکی ساردم هەلکێشا • وتم : یاربی تـۆ قادرو خبیری کەیفی خۆتە شوکرم بە بەشت تۆ خـۆت نەجاتدەری نەجـاتم بدەی لەم مصیبتو بەڵا ناحەقە • ئەمە چ جێگاو لایەکە ، ئەمە چ نوعـە مخلوقێکن لێرەدا ، ئەمانە چ دڵو دەرۆنێکیان هەیە ، من چۆن ڕزگار ببم لە دەست ئەم زاڵمە بێ انصافانە ، هەروا قەدرێك لەم خەیاڵاتەدا بـۆم دوایی وتم فائدەی نیە، بزانم دوایی ئەم کارە بە چی ئەگات، جارێ با بزانم ئەم ژۆرەی کەدەنگی ئەم ئافرەتانەی لێ دێت چیەو لە قسەو گفتو گۆی ئەوانە من ڕێگای نەجات ئەدۆزمەوە بۆ خۆم یان نا • هەستام وردە وردە چومە بەر پەنجەرەکان کە بەسەر ژۆری ژنەکاندا بو ، لەوێ ڕاوەستام گوێم ڕاگرت بەتەواوی گوێم لە هەمۆ قسەو ئەمبەرو ئەوبەریان بو ، بەڵام چـاوم لە هیچ نەبو ، گوێـم دایە قسەکان ، غەیری باسی ئالتونو مجوهراتو جلی جوانو ئەم نەوعە قسانە نەبێ جارێ هیچیترم بەر گوێ نەئەکەوت • دەنگێ ئەهات ئەیوت قوربان ژنی فلانەکەس جوتێ گوارەی زۆر عەتیکەی هەیـە ، ئەو ساڵە مێردەکەی لە ئەستەمبوڵەوە بۆی هێناوە • سێ ڕیز ئەلماسی تیا قایم کراوە ، ئەڵێن لەوێ بە سەدو پەنجا لیرەی کڕیوە ، بەڵام قیمەتی هەر تەواو نابێ ،

بەخوا ئەوە هەر بۆ تۆ جوانە ، تۆ لێی بسێنە بۆ خــۆت • ئەویش ئەیوت سبەینێ زوو ئەنێرمە سەری خۆشی بێو ترشی بێ لێی ئەسێنم • ئەو شتیوای بۆ چیە ، با بە بێپارە ئەوە بدا بە من • لەپاش ئەوە دەنگی پیرێژنێك هات لەولاوە وتی قوربان فلانە ژن ئەموستیلەیەکی زمروتی هەیە من خۆم بە شەو دیومە وەك چرا ئەدرەوشێتەوە ، دلی نــایەت بۆخۆی بیکاتە دەستی چەند جار ( ٣٠ ) لیرەیان داوەتێ نایدا • مێردەکەی ئەو ساڵە لە شام کڕیویەتی بە چل لیرە بۆی ، بەخوا ئەوە هەر بۆ دەستو پەنجەی تۆ جوانە ، ئەویش وتی بەخوا ڕاست ئەکەی من زۆر حەز لە ئەموستیلەیەکیوا ئەکەم ، بەیانی بیرم بخەرەوە بنێرمە سەری بیهێنم • یەکێکیش وتی : بەخوا رەنــگە دلی نەیە بیدات ، زۆری خۆش ئەوێ ، ئەویش وتی چۆنی نادا ، بەخوا ئەگەر نەیدا مێردەکەی حبس ئەکەمو ماڵەکەشیان تالان ئەکەم • ئــەو پەڕۆ بەسەرانە شتی وایان بۆ چیە •

گوێم گرت ژنێکیتر لەولاوە وتی بەخوا قوربان من بیستومە مــالی فلانە کەس پیرۆزەیەکیان هەیە ، سالێ لە کەربەلا کڕیویانە بە هەشتا لیرە ، هینی شای عەجەم بوە ، لەوێ بەخشیویەتی دەست ئەوان کەوتوە ، ئــەوە بۆ تۆ جوانو باشە ، ئەڵێن پیرۆزە بۆ ڕوناکیی چــاوو هێزی دڵ چــاکە ، ئەویش وتی بەخوا ڕاست ئەکەیت خۆ ئەوان هەر خزمەتکــاری خۆمــان بوُن ، سبحەینێ زوو تۆ بچۆ ئەو پیرۆزەیەم بۆ بهێنــە ، ئەویش وتی چاکــە قوربان • دوای ئەوانە گوێم گرت یەکێك هاتە پێشەوە ، وتی قوربان فلانە کەس توپێ تاقەی یەمەنیو دوو چەفتــەی سورمەی زۆر چــاکی هێناوەتە خزمەتت، ئەلێ ئێمە خۆی ئەزانێ هەر خزمەتکاری ئەم قاپیە بوین ، کوڕەکەم هەتا ئێستا هەر توتونچی بوە ، جگەرەی فرۆشتوە ئێستا هیچ دەرامەتی نیەو زۆر کەمدەستە خۆی خستۆتە ئەم قاپیە کە ئەمر بکەیت کوڕەکەی بکەن بە (ضابط) • وتی ئا تاقەو چەفتەکان بێنن بیانبینم • بە خشوهوڕ هێنایانە پێشەوە (وابزانم بەر دلی کەوت) ، وتی هەلیگرن ، ئەیەڕۆ ، جا ئەمەیشی

پێ نەئەویست ، خۆ ئەوان باوکیشیان هەر خزمەتکاری خۆمان بوون ، ئا فلآنەکەس بچۆ بە فیسارەکەس بلێ ئەبێ سبحەینێ ئەم کـوڕە بە (ضابط) قەید بکات ، بە قەبری باوکم نەیـکات دلّم عاجز ئەبێت ، شـلّپ دەستی ماچ‌کردو قەدرێ دوعای بۆ کردو ڕۆیشت • لەپاشان گوێم‌گرت ، یەکێکی‌تر هات (ئەمە دەنگی پیـاو بو) ، وتی قوربـان کوێخا فـلآن هەمۆ ئەیزانێ رەچەلەکیان هەمۆ لەم قاپیەدا بڕاوەتەوە ، باوو باپیریان هەمۆ خزمەتکاری ئەم قاپیە بوون ، کەچی ئێستا بە قسەی بەدخوا بۆیـان لێ‌داوەو حەپسیان کردوە ، خەریکن بیفەوتێنن ، ئەمەش ڕەوای حەق نیە بوختانی پێ‌ئەکەن ، مەگەر خوا بیزانێت چەنـد خزمەتی هەیە من ئەیزانم بۆ ئێـوە چەند جار خوێنی خۆی ناوەتە کاسەو فلآنە جێگەو فلآنە جێگە ، ئەو سالە خۆی بە کوشت داو خوا نەیکوشت‌و چەند کەسی کوشت ، بە هێواشێکیشەوە وتی بارێك برنج‌و هیزەیەك ڕۆن‌و پێستەیەك پەنیریشی هێناوە بۆ (مطبخ)و دە پێنج لیرەییشی هێناوەتە خزمەت خۆت • خانم کە ئەمەی بیست وتی چۆن حبس کراوەو کێ حبسی کردوەو بۆچی حبس کراوە ؟ ئەوە هەر هی خۆمان بوە ، بە قەبری باوکم قبولّی ناکەم ، ئا فلآنە کەس بچۆ بلێ هەر ئێستا ئەبێ کوێخا فلآن بەرەللآ بکرێ ، هەر ئەمشەو ئەبێت بێتە دەرەوە (لە دلّی خۆما وتم خۆزگەم بە خۆی) ، شلّپ دەستی ماچ کرایەوە ، ئەویش ڕۆیەوە •

دواجار گوێم گرت پیرێژنێکی‌تر هاتە پێشەوە بە منجە منجەوە وتی : قوربان فلآنەکەس هاتۆتە خزمەتت ، مێردەکەی لە بەغدا هاتۆتەوە ، بەشـی دۆ کەوا گورۆنی گول باتمانی هێناوە ، ئەوا بەم عومرە گەیشتوم شتی‌وام نەدیوەو نەبیستوە ، هەروا پرشنگی لێ ئەبێتەوە ، ئاوی چاوی پیاو ئەبات ، بەخوا ئەوە هەر بۆ کەوای خۆت لائقە • تۆپێ کەتانی ڕێزەو تۆپێ برنجوکی چاکیشی هێناوە ، ئەیەڕۆ تۆ چۆن قبولّ ئەکەیت • فلآنەکەس ، ها ، لەبیرت نایەت سالّی حریت حریتەکە وتیان چەندێ قسـەی خراپی کردبو ، بەخوا قوربان راستە بێ‌ئەدەبیشە ، بەلآم ئێوە هەر نازانن ئیـش بکەن ، ئێستـا

ئەوەتە ئەو کراوە بــە مدیری فلانــە دائرە ، ئەمیش هــەروا بێماموریت ئەسوڕێتەوە ، ئەویش وتی بە قەبری باوکم‌و بەو قورعانــەی لەسەر ڕانی راستم داناوە ئاگایشم لێ نیەو نەم‌زانیوە ، ئەگینا من چــۆن قبۆڵم ئەکرد ، ئەی ئــەوە نەئەبو زو پێم‌بلێن ، ئــا بچن بــە فلان بلێن ... عزل ئەکرێ‌و مێردەکەی ئەم لەجێگای ئەو ئەبێ دانرێ ، شلپەی دەست ماچ کردنێکی‌تریش هات . تێ وردبومەوە لەم نەوعە ئیشانەو گەلێك ئیشی‌تری لەمانە زل‌تر ، هەموی لەو سەعاتەدا لەو ژورە بەورەنگە برایەوە ، منیــش لە دلی خۆمــا وتم ئیشی ئێرە وادیارە هەموی عبارەتە لە خەلك روتاندنەوەو شــتی باش‌و بەقیمەتی ئەم‌و ئەو زەوت‌کردن‌و بە بەرتیل هەتیوو مەتیو لەسەر ئیشی زل‌و گەورە دانان‌و مالی تــاقمێك بە قوڕ گرتن‌و هەمــو عالەم بــاوو باپیریان خزمەتکاری ئەو قــاپیە بوون ، لەبەرخۆمەوە وتم من نــە خۆم‌و نە باوکم وادیارە خزمەتکاری ئەم قاپیە نەبوین‌و تۆپە تاقەو پارچە ئەلماس‌و یاقوتیشم نیە بیدەم ، کەوابو لەم ژورە ڕێگای نەجات بۆ خۆم نادۆزمەوە ، ئەم ژورە محکمەی لاهای بو ، مجلسی لۆزان‌و عصبة الامم بو ، چی‌بو ، لە زەرفی سعاتێکدا سەد نەوع ئیشی تیا حل بوو بڕایەوە ، هەمویشی کوتوپڕ جێبەجێ بون، نانی چەند کەس بڕاو خوێنی چەند مظلوم ون‌بو و چەند کەس دامەزرا، حەق‌و مالی چەند کەس زەوت کرا . دواجــار وتم بــا بچم بەلای ئەم‌لاوە بزانم لەم‌لایەوە چی ئەبینم‌و لەم رۆناکیەوە رێی نەجات هیچ ئەدۆزمەوە یان نە ؟ پەنجەرەکانی ئــەم‌لا زۆر نزم‌بون ، هەمۆ شــتێکم ئەبینی ، ڕوانیم گەورەکە کە ئەمــری کرد منیان خستە ئەو ژورە خــۆی بە کەشو فشێکەوە دانیشتوەو فلق‌و هۆڕ تێر گەلە ئەکێشێت . کابرای‌تریش کە سەر لە بەیانی لەگەل ملۆزمەکان منی هێنــایە ژورەوە ، ئەویــش لەخوارەوە وەستاوە ، هەرچی حــرکات‌و وضعیتی گەورەکە هەیە هەموی هــەر غضبەو انانیتە ، هەرچی حرکات‌و سکناتی ئەویشیان هەیە ، هەموی هەر تسلیم‌و اطاعەتێکی پر لە قوماربازی‌و درۆو ریاییە ، یەکیکی‌تریش لە پەنا دەرگاکەدا وەستابو ،

فشەی ئەهات ، دەستێکی خستبوە سەر مشتوی خەنجەرەکەی ، هەموو لەشی ئەجولایەوە ، هەروا خوێن لە هەموو ئازای ئەباری ، بێدەنگو بێسەنگ کەس قسەی نەئەکرد هەمو قورو قەپیان کردبو • لەپاش نەختێ گەورەکە سەری بەرزکردەوە ڕوی کردە کابرای دانئالتون وتی: تۆ نابێ قەت قسەیەکی راستت بێ ، ئاخریەکەی تۆ سەری من بە فەتارەت ئەدەیت ، ئاخر ئەو هەمو هاژەو هوشەیەی تۆ کردت نەتیجەی کوانێ ، تۆ کە هاتیتەوە وتت چی ، کەچی ئێستا دنیا چۆنە ، ئەوانەی تۆ هەڵترشتن هەمو درۆو فیشال بون ، بەخوا تۆ هەر بۆ کوشتن چاکی • ئەویش وتی قوربان بە چیت باوەڕە ئەوانەی عەرزم کردیت هەمو ڕاست بونو هیچیان درۆ نەبون ، بەلام من بلێم چی مەسئەلەی مەشهورە ئەڵێ (دار پوازی لە خۆی نەبێ ناقلیشێ) ، لەپاش من هەر لە قەومەکانی خۆمان چون ئیشەکەیان لێ تێکدایەن ، ئەگینا ئێستا ئیش لە جێگایەکیتر ئەبو • کولەبنەکەی کە لای خوارو وەستابو ، ئەویش هەڵیدایە وتی : بەخوا قوربان راست ئەکات ، قسە هەر ئەمەیە • ئیتر ئەویش بە بێ ورد بونەوەو لێکدانەوە کوتوپڕ وتی بەخوا راستەو دەستی کرد بە قسەی ناشیرینو جنێوی خراپ بەوانە ، دەستێکی دا بە دەستا وتی : ئاخ من چی بکەم ئەترسم هەر نەگەم بەو ڕۆژە ، ئەمانە وجودیان لەناودا هەڵگیرێ • کولە بنەی لای خوارو دیسانەوە هەڵیدایە وتی : قوربان هێشتا لەناو خۆماندا هەزار کەسی خراپمان تێدایە ، هەر خەریکی ئیش تێکدانو جاسوسین ، بەخوا ئەمانە دەفع بکرێنو لەناو هەڵگیرێن چاکە • گەورە لەم قسانە ڕقی هەستاو چاوی لێ دەرپەڕیو مارپێچی تێرگەلەکەی فڕێداو هەستایە سەرپیان وتی : هەرچی ئیش لەمن تێك بداو سەرم لێ بشێوێنێ نابێ بمێنێ ، کوانێ مەلاکان نەهاتن ، ئەوانیش وتیان قوربان نیو سەعات زیاترە چوون بە شوێنیاندا ، هەر ئێستا دێن • ئاغاو ئەوان هاتون ئەوەتان لەولا دانیشتون ، وتی باشە با مەلاکانیش بێن (وەکو لەپێشەوە تەرتیباتێکیان

کردبێو خەریکی ئیشێك بن کە بە مەلاکانی هەلسوڕێنن وابو) ئەویش لە جێگەی خۆی دانیشتەوە ، نەختێکی پێچو ، سەری هەڵبڕی ڕوی کردە کابرای کولەبنە وتی : لیرەکانت گۆڕیوەتەوە ، وتی بەلێ قوربان بەلام نرخی لیرە تۆزێك زیادی کردوە ، ئەم حەفتەیە ئێمە چوار پێنج هەزارمان زیاتر گۆڕیوەتەوە ، لەبەر ئەوە لەناو بازاڕا زیادی کردوە ، ئەگەر چەند ڕۆژێکی‌تر سەبر بکەین ، بەلکو ئەوسا ئەوەندەی‌تریش بگۆڕینەوە ، هەروا بەرەبەرە هەتا تەواو ئەبێ ، کابرای‌تریش وتی قوربان بعضێك بانقەنەوتی هەزار روپیەیی‌و سەد روپیەییش ئەگەر بگۆڕیتەوە ئەوانیش سوكو ڕەحەتن ، خراپ نین ، ئەویش وتی باشە ، بەلام جارێ هەر لیرەکان بگۆڕینەوە باشترە ئەوانیش وتیان : لیرە لەم یەك دو مانگەدا گەلێك زیادی کردوەچونکە ئێمە لەم بەینەدا زۆرمان گۆڕیوەتەوە ، ئەم خەبەرە ئەرواتە بەم‌لاو بەولادا ، هەتا هەشت نۆ ڕۆژی‌تر ڕەنگە لیرەیەکی زۆربێت بۆ ئێرە ، ئەوسا ئێمەش دە پانزە بیست هەزارێکی‌تریش ئەگۆڕینەوە ، ئەویش وتی : من ئەمانە نازانم ، ئەم مانگە هەتا ئەچێتە سەر ئەبێ سەد هەزار لیرەی‌ترم بۆ بگۆڕنەوەو بۆم تەواو بکەن ، ئەوانیش هەردوکیان وتیان : تۆ خۆش بیت ئینشاللا تەواو ئەبێ • منیش لەم وەختەدا لە دلی خۆما وتم ، ناکات لەم هەمو پارەیە کە گشتی هینی موسولمانانە دەست بەرێ هەزار لیرەی بدا بە من بلێ بڕۆرەوە ناو مالو مندالی خۆت‌و دانیشە بە ڕەحەتی بیخۆن • ئەمجا ڕوی کردە کابرا وتی : قسەی خۆمان بێ ئێستا تۆو فلانە کەس ، یەکی دە هەزار لیرەیەکتان ناوەتە سەریەك ، ئەویش بە پێکەنینەوە وتی : قوربان سەری تۆ خۆش‌بێت ، هەمو دنیا هینی ئێمەیە ، وتی : نەء ••• ئەم قسانە هیچن ئێستا ئەویش خۆی دێتە ئێرە ، لێی‌بپرسە بزانە من ڕاست ئەکەم یان نا ؟ مەگەر هەر من ئێوە بناسم • هەروا لەم نەوعە قسانە بعضێك گفت‌وگۆیان کرد ، دواجار کابراکە وتی : قوربان تەقاویتەکان هەراسیان بە عالەم هەلگرتوە بۆ معاش نازانم ئەمرتان بە چیە ، ئەویش تورە بوو وتی : معاش لەکوێ بێنم بۆ

تەقاویتی موبـارەك ، وا عەسـکەرو مأمـورەکان دو مانـگە معاشـیان وەرنەگرتوە ، ئەویش وتی : قوربان زۆریان هەیە شەش مانگە پولیکیان وەرنەگرتوە ، ئەمـانەش هەمو قیرسیچمەو نەبەزو سـەهەندەن ، لە هەر قوژبنێکەوە رێگایان بو ، داوا ئەکەنو هاوار ئەکەن ، سەریان لەم عالەمە سەندوە ، لە هەمو مالاّنو کـولاّن کە یەکێك ئەبینن دەست ئـەکەن بە تعجیـزات • ئەویش وتی ئەمانـە چەقاوەسونو چـەرداوەرۆن ، کەواتە خو پارە نادرێ بەوانە ئەم مانگە هەروا یەکی چەند حوقەیەك چەلتوکیان بدەنێ لەجیاتی معاش با بیخۆن یاخوا هەر ئەوە بخۆن ، ئەمانە بۆچی چاکن معاشیان بدرێتێ ؟ ئەویش وتی : قوربان باشە •

ئەمجا یەکێك هاتە ژورەوە وتی : قوربان مەلاکان تەشریفیان هێناوە ، فەرموی : بەخێر بێن با بێنە ژورەوە • رۆانیم چوار مـەلای نورانی یەك لەدوای یەك هاتنە ژورەوە ، هەمو جبەی قۆلفش لەبەردا ، چاویان رشتوە ، مێزەرەکانیان هەمو سپی وەکو چوری شیر ، هاتن سەلامیان بەئەدەبەوە کردو دانیشتن ، هەمو لێویان ئەجولاّیەوە لاموایە ویردو سەلاّواتیان ئەخوێند ، لەپاش ئەوان سێ چوار کەسیتر هاتن ، یەکێکیان پیاوێکی گەورە دیار بو هات چوە لای ژورەوە دانیشت ، ئەوانیتریش لە خوارەوە دانیشتن ، دو سێ کەسیتریش بە پیانەوە وسـتابون ، منیش نەختێـك دلم خوش بو وتم ئیستا ئەم پیاوە کە ئەم مەلایانەو ئەم زاتانەی کوکردوتەوە ئومێد وایە شتی باش بکات ، هەلبەت هەمو ئیشێك بە مشاوەرەی علمـاو پیاوی زانستو باشو تێگەیشتو ئەکات ، خو هیچ نەبێ ئەمانە مەیدانی ظلمو ناحقیو زور نادەن ، ئینشاللاّ لەم ناوەدا ئیشی منیش دێتە ناوەوەو منیش نەجاتم ئەبێ ، بەم ئومێدو ئەمەلە دلم خوش بو ، هەمو لەشم کرد بە گوێچکە وتم : ئەبێ هەمو قسەکانیان ببیەم ، هەناسەم لە خوم بڕی وشك وەستام وتم بزانم خوا چی ئەکات ، ئەمە من جارێ هەر بو شتێك ئەگەڕێم بەلکو ڕێگای نجاتێك بو خوم بدوزمەوەو لەم تاریکیەدا روناکیەك ببینمەوە ، هەتا ئەهات ئومێدم

زلتر ئەبۆ ، ئـەمـوت : خۆ من هیچم لەسەر نیە ســوچو گوناهێکم نیە ، هەلبەت خوا رەحم ئەیێتــە دلیەوە ، ئەم کابرایە بە خــوتو خۆڕایی من توشی هیــچ نــاکات • ئەمجــارە گــەورەکە ڕۆی کــردە یەکێـك لە راوەستاوەکان وتی : قســەی محرمو خصوصی هەیە وریابــن کەس لەم دەورە نەبێ ، قسەکانمــان لەناو خۆماندا نەچێتــە دەرەوە ، ئەویش چوە دەرەوە لەپاش نەختێك هاتەوە وتی : قوربان کەسی لێ نیە • خۆ ئاگایشیان لێ نەبو کە لە ژۆری ژنەکانەوە قسەیان ئەکرد ئەیانوت ئەمشەو مەلاکانو فلانو فیسار گرد کراونەتەوە ئیشیان هەیە ، لەوێــوە دو سێ ژن دەستو پیوەند تەگبیریان کرد کــە لەپشتەوە بچن گوێ لە قســەکان بگرن ، لەو وەختەدا گوێم لە ترپو هوڕی پێیان بو ، لەودیو هۆدەکەوە کە منی تێدا بوم ، سێ چوارێك چونو لەوێ وەستانو گوێیان لە قسەو باس گرت •

**گفتوگۆ کردن ، فتوا وەرگرتن ، ئەمر بە اجرا کردن ، مسئلەی سیاسیە**

لەپاشان گەورەکە دەمی هەلهێنایەوەو نەختێك بە تورەییەوە دەستی بە قسەکردن کرد وتی : من ئەمە چەند سالە هەولو تەقەلا ئەدەم ، برینداری و حەپسیو رەزالەتم کێشا ، انواعی مصیبتو مەرارەتم چێشت، دەستم لەسەرو مالی خۆم شت، هاتم تێکوشام وتم بەلکو ئەم میللەتە بۆ خۆی هەناسەیەکی رەحەتی هەلکێشێت سەربەستو ئازایانە بۆ خۆمان بژینو دەستی بیگانەمان بەسەرەوە نەبێ، ئیمەیش وەکو ئەم میللەتانەی تر بکەوینە رەحەتیو خۆشیو زیادیو گەورەیی، دەولەمەندو سەربەرز بین ، دینەکەمان بەرز بێتەوە، چەند جار چوم بەگژ ئینگلیزدا ، لەگەل تورکدا تێكچوم ، تەشەبوسم بە روسیەو بولشــەویك کرد ، چەند خوێنمــان ڕشت ، من ئەمانەم هیچیان بۆ خۆم نەکردوە ، هەمویانم بۆ ئەم دینو میللەتە کردوە ، وتومە با میللەتەکە بکەوێتە رەحەتیو سعادەتەوە ، دینەکەمان زیــاد بکاتو بەرز بێتەوە ، کەچی لەگەل ئەم هەمو ئەحوالانەدا ، ئەوەتا هەمومان ئەیبینین ، بەشێکیزۆر لەم میللەتە

لایان‌داوه له من‌و چۆن شوێن غەیرەدین کەوتون ، زۆیشــتون بۆ ولاّتان خزمەتی فکری ئەوان ئەکەن ، هەمو ماڵ‌و حاڵ‌و ژنیان بەجێ هێشتوه لێرەو خۆیان له ولاتان به دیار غەیره دینــەوه دانیشــتون‌و ئیمه واین لەم حاڵ‌و رەزالەتــەدا ، عەســکەرو مأمورو علماکانمان هــەمو أحتیــاج‌و بێ اداره ماونەتەوه ، ئاخۆ فتوای شرعی بۆ ئەمانه چۆنه ؟ زۆی کرده مەلاکان وتی : ئەی علمای میللەت بزانم ئیوه دەرحەق بەمانه ، بەم ظالم و بێ‌دین‌و مرتدانه ( ! ) قسەتان چیەو ئەلین چی ، ئاخۆ ماڵ‌و حــاڵ‌و ژنی ئەمانه چیان دەرحەق بکرێت باشه ؟ ٠ مەلاکان هەر چواریان رەنگیکیان هێناو بردو ســەیرێکی یەکتریان کرد ، لەدواییدا یەکیکیان تیابوو نەختێك بەپەله قســەی ئەکردو دانیشی له دەما نەمابۆ ، چمکی مێزەره سپیەکەی شۆڕبۆبوەوه خوارەوه هەتا لای پشتێنەکەی ، عەسایەکی باسقەندی بەدەستەوه بوو ، سیواکێکی درێژی کردبو به پشتێنەکەیدا ، جارجار تۆزێك بڕتوتێ هەڵئەمژی ، لکی فەقیانه سپیەکەی له قۆلی جبەکەیەوه هاتبوه دەرەوه ، هەر عەجەلەو پەلەی ئەکرد بۆ قسه کردن، لەپرێکدا تێی هەلکرد وتی : بەلێ ئەم نەوعه شخصانه کەوا خزمەتی دینی خۆیان ناکەن‌و بــۆ دین‌و ئایــین هــەول نادەن‌و شوین غەیرەدین ئەکەون‌و لەپێناوی دین‌و احکامی شەریعەتی غەڕادا سعی ناکەن و خزمەتی غەیره دین ئەکەن به موافق قولی أمام ٠٠٠ و أمام ٠٠٠ و امام ٠٠٠ کێ ( ئیتر نازانم ناوی ده دوانزەیەك لەم ئیمامانەی هەڵڕشــت ، هەر ناوی مجتهدو أمام بو وەك برێشکەی گەنمه شامی له دەمی هەڵئەتۆقی ) ئەمانه به نظر مرتدو بێ‌دین تماشایان ئەکرێ ، لازمه مالیان هەمۆ بۆ بیت‌المال صەرف بکرێ ، ژنیشیان لێ تفریق بکرێ و ئەمانه له پاش مروری عدەی شــرعی ئەتوانن شویەکی‌تر بۆ خۆیان بکەن ٠ یەکیکی‌تر له مەلاکان وابزانم زمانی وەکو نەختێك لاڵ بێ وابو ، چونکه هەر قسەیەکی ئەکرد ، تفێکی قوت ئەداو به توره توره کلمەییکی تری تەواو ئەکرد ، لەگەل قسەکان خێرا خێرا دەست‌و پەلی ئەجولایەوه ، سەرو سنگی ئەهێناو ئــەبرد وتی : بەلێ وەکو

فلآن ئەفەرموێت وایە ، ئەمانــە قولێکی معروفو معتبرو مقتــدا بیهێن •
یەکێکیتری ملدرێژیان تێدابو ، چاوشین ، مو زەرد ، وەکو شینە شاهۆ
ملی هەلبڕیو سنگی دایە پێشەوە وتی : خۆ من بۆ ئەم مسائلی شرعیەیە
دەمێکە خەریکمو هەوڵئەدەم ، هەتاوەکو هەمو ئــەم نەوعە مەسئەلانەم
خستۆتە سەر کاغەز ( دەستی کرد بە باخەلیــا کاغەزێکی نوسراوی درێژی
هێنایە دەرەوەو خستیە ســەر مێزەکە ) وتی : هــەر ئەمەیش نیــە ، زۆر
شتیتریوا هەیە ، ئەم ئیشــانە وا چاکە سەعاتێك زوتــر جێبەجێ بکرێو
بەربەستی ئەم ئەحوالآنە بکرێت ، ئەگینا ئەم دینە بەجارێك مەحو ئەبێتەوە ،
بەلێ بە هەمو مەذهەبێك مــالو ژنی ئەمانە بۆ ئەم بقیة المؤمنینــە حەلاڵەو
ڕەوایە ، ئنجا ڕوی کردە سەر سپیەکەی لای ســەروی هەمویانەوە وتی :
قوربان تۆ چی ئەفەرمویت ، ئەویش مەلایەکی ڕیش ماشو برنج بە وقارەوە
لای سەروی هەمویان کەوتبو بە عظمت دانیشتبو وەکو چاوی نەختێك کز
بێت وا دیار بو کە مەلای ســورە قاقەزەکەی خستە سەر مێــزەکە ، ئەو
گورجوگۆل هەلیگرتو عەینەکێکی کردە چاویو سەیری کرد ، ئەویش
ئەم جارە کاغەزەکەی داناو دەستی کــرد بە گفتوگۆ ( بە قســەکانیا وا
دەرئەکەوت خەلکی ئەو گەرمیانە بێت ) وتی بەلێ ئــەم مسئلەیە ظاهرە بە
هەمو مەذهەبێك مالو سەروەتیان لێ جوێ ئەکرێتەوەو ئەم قولانە هەمو
مصدقن •

منیش لە ژورەوە هەروا تاس ئەیبردمــەوە ، ئەموت ئەی هاوار بە
مالم ، بەخوا منو هەزاری وەکو منیش بێتاوانو بێگوناح محو بوینەوە ،
من ئومیدی چیم هەبو ، کەچی چیم دیو چیم بیست ، بەجــارێك هەردو
ئەژنۆم شکاو موچڕکێك لەتەپلی سەرمەوە هات ، لەبەری پێمەوە دەرچو ،
هەروا حەپەسام ، هۆشو شعورم نەما ، تەمام بو بەهــەردو چەپۆك بدەم
بە سەری خۆما ، هەتا هێزم تێدایە بقیژێنم ، دواجار سەیرم کرد گەورەکە
ئەمجاریش بە دەنگێکی بەرزەوە وتی : ئەمە باشە ، مسئلەیەکیتریش هەیە

ئەویشتان بۆ بکەمەوە ، ئەوانیش چاویان لێ سـوور بۆبو ، وتیان فەرمو بزانین ئەو چۆنە •• وەکو پێموتن ئێمە ئەمە هەمۆی لەڕێی دینی ئیسلامدا ئەکەین ، ئێستا غەیری ئەوانەی کەوا ڕۆیشتونو لەملاولا خزمەتی غەیـرە دین ئەکەن ، بعضێك کەسی‌تر هەیە لەناو خۆماندا لەوان زیاتـر خەریکی محوی دینن بە هەمۆ نەوعێك بۆ نەمانی ئێمەو ئەم حاڵە (کە هەمۆ بۆ دینی ئەکەین ) هەوڵ ئەدەنو جاسوسی بۆ غەیرە دینەکە ئەکەنو لەجیاتی تەلقینی أهالیەکە هەر خەریکی کفر کردنو گاڵتە بە مشایخو علمای محترمن ، ئەمانە ئەگەر هەروا بمێنن ، ئەمینم کە بەرە بەرە ئەم تۆزە دینە کەوا ئێمە هەوڵ بۆ زیادی ئەدەین بەجارێك محوی ئەکەنەوە ، ئێمەیشو علمای ملتەکەش ( جارو بار بۆ قوەتی قسەکانی خۆی وەکو خوێی چێشت ناوی علماکانی تێ‌ئەخست ) ئەفەوتێنن ، ئـەم نوعە اشخاصـە مضرانە بە نـاوی دینەوە فەوتاندنیان لەسەر ئێمە واجبو لازمە یان نا ؟

سۆرەی چاوشین لەپڕێکدا قسەکانی لە دەم قۆستەوەو تێ‌هەڵچو وتی : ئاخر ئەوەی منیش عەرزم کردنو نوسیومە ئەم مسألەیەیە ، ئەگەر بێتو حاڵ بەم رەنگە دەوام بکات ئەوا دینو دنیامان بە جارێ محو ئەبێتەوە ، لە زووەوە بەرهەڵستی ئەمە نەکرێت نابێ ، بە هەمۆ مذهبێك نەهێشتنی ئەمانە بۆ دینو ملت مصلحتو لازمـە • هێشتا ئەو قسەکەی تەواو نەکـردبو مەلا بڕنوتی کێشەکەیان ملی قوت کردەوەو هەڵیدایەو بە پەلەپەلو خێرا خێرا دەستی پێ‌کرد ، دە دوانزە ( قال ، يقول ، قيل )ی‌تری هەڵڕشت ، دیسانەوە ناوی چەند امامێکی‌تری خوێندەوە ، فرموی : بەڵێ نەمانی ئەمانە بە ناوی بقـاو تحکیمی دینـەوەو مصلحتی ملكو ملتە وە لازمو واجبـە • جۆتە مەلاکەی‌تریش دەسـتیان دا بەسنگا بە ( صـدقت ، صدقت ، أحسنت ، أحسنت ) تصدیقیان کردو فتوایان لەسەردا • یەکێك لەوانەی دانیشتبونو لە ئەوەڵی ئەم قسانەوە چـرکەی لەخۆی بڕیبو ، بە هەمـۆ اعضاکانیەوە گوێی لەم قسانە گرتبۆ ، وەك مأموری اجرای ئەم فتوا ناحەقـانە بێتو

هەمو ئۆباڵو گوناحی ئەمانە لەسەر ئەوبێ ، لەپاش ئەم قســانە وتی من قسەیەکتان عرض ئەکەم ، بزانم ئێوە چی ئەفەرمۆن ، وتیان : بفەرمو بزانین ئەڵێی چی ؟

وتی : ئەم خلقانە کەوا ئێستا ئێوە سەرو ماڵو ژنیاتتان حەلاڵ کردن ، ئەمانە ئەگەر بێتو خۆیان لێرە موجود بونایــەو مدافعەیەکی شرعی خۆیان بکردایە • دیسانەوە ئێوە لەسەر ئەم قولو فتوایە ئەمان یان نا ؟

سوورە چاو شینەکەو لالە پەتەکە هەردوکیان بەجــارێ هەڵیاندایە وتیان : مدافعەی وەکو چی ؟ ئەویش وتی بەڵکو ئەمانە بڵێن ئەم حکومتو ادارەیە ، حکومەتێکیوا نیە کە بتوانێ جارێ بەم رەنگە ادارەی ئەم ملكو ملتە بکاتو خۆیو میللەتەکە بێنێتە ناوو ببێ بە صاحێبی ئەم هەمو ئیسلامەو بچێت بەگژ ئەم حکومەتانەداو لە نتیجەدا ئــەم عباد اللەیە تۆشی فەلاکتو ضرری گەورە ببێت • بەم رەنگە ئیشی ناچێتە ســەر ، ئێمەش لەبەرئەوە وامان کردوەو ئەیکەین ( کابرا نەیئەویست یاخود نەیئەوێرا بەتەواوەتی دان بە هەمو قسەکاندا بنێ بۆیە هەر ئەوەندەی بۆ بێــژرا ) ، ئیتر ئەو مەلایەی کە لە سەرو هەمویانــەوە دانیشتبو جوابی دایەوە وتی : آغــا ، آغا ، ئەو مدافعەیە شرعی نیەو لە نظر شریعتدا مردودە ، چونکە ئەمانە وادیارە لەسەر محوی دینن ، کەوابو ئەم معذرەتانەیان لێ قبــوڵ ناکــرێ ( لەم قسانەدا گەورەکە رەنگێکی هێنــاو برد ، رەنگی ســور بوەوە ، بە تیــلایی چاو سەیرێکی هەمــو مەلاکانو ئاغاکەی کرد لەپاشان چــاوی گەش بوەوەو دامرکایەوە ) ، ئیتر ئاغاش قسەی پێ نەما وتی : کەوابو هیچ •

ئیتر من لەوێوە نە هۆشم ماو نە شعور ، جارێ وەکو شێت هەستام قەدرێك لە ژورەکەدا ئەمسەرەو سەرم کرد ، هەرچی خوێن لە رەگەکانمدا هەبو مابو ، هەموی کەوتە جوڵە جوڵو هاتوچۆ ، پێستی لەشم ئاگری لێ ئەبوەوە ، هەردو چاوم دەرپەڕی ، دانەکانم تەقە تەق بە یەکیانا ئەدا • تەمام

بۆ پەلاماری پەنجەرەکان بدەمو هەڵکوتمە سەر مجلسەکە، دەست بنێمە بێنی مەلاکانو ئەوانی‌تر ، وتم : یارەبی ئەمە چ دڵو دەرۆنو وجدانێکە ، ئەمە چ تطبیقاتی شرعو قاعدەیەکە ، ئەمانە چۆن ئەم قرارو فتوایەیان دا ؟ ئەوانەی کە رایان کردوەو خۆیان لە شالآوو هالآوی ظلمو زۆری ئەم ظالمو خوێن خۆرانە نجات داوە ، ئەوا بەجارێك ژنو مالیان حلاڵ کرا : ئـەوی لەژێر لافاوی غدری ئەمانەدا ماوەتەوە وەکو ئەمان خەریکی پیاو کوشتنو ظلمو زۆر نیە ، ئەوەتا وا فتوای کوشتنی ئەویش دراو ئەیکوژن ، ئاخۆ ئەمانە هیچ لە خواو قیامەتو لێپرسینەوەو عذاب ناترسن ، چونـکە ئەم زمانە هەروا لە دەمی انساندا تەڕو پاراو نابێت ، ئاخری مردنو پرسینەوەیەك هەر هەیە ، حەقو حساب ئەبێت . هیچ لەوە ناترسن کە لێیان بپرسن ئایا ئێوە بە چ حەقو صەلاحیەتێك وا لەم عباد اللەیە ئەکەن . جارێ وتم ئەم کابرایە کەوا هەر ناوی دین ئەباتو ئەڵێ من بۆ دینم کردوەو لەڕێی دیندا ئەیکەم هیچ تەریق نابێتەوەو لە خوا ناترسێ بڵێ من چ حەقێـکم بەسەر ئەم عباد اللەیەوە هەیە ، ئەبم بە باعسی مەحوی سەرو مالیان ، بە چ ناوێکەوەو بۆ چ دینێكو بە حوکمی کام شریعت ئەمانە دەرئەکەم ، ئەمـانەی لەتاو ظلمو زۆر وازیان لە ملـكو ماڵو ناموسو حیثیتو جێگای خۆیـان هێناوەو دەربەدەری ولآتان بۆن ، ئاخۆ ئەمانە شوێنی غەیرەدین کەوتون ، یاخود لە ترسی ئەم جۆرە ظلمە گەورە ناحەقانە ( کە دارو بەرد لەبەری ئەلەرزێ )و نیشتومەتە سەریان بە نای ناحـەق ماڵو خوێنیان ئەخۆمو ئەخـۆمەوە ، ڕایانکردۆتە پەنای عدالتو أمنیت . زۆرم بەلاوە سەیرو عجایب بۆ کـە خۆی لە پێش مجلسەکەدا قسەی لە سەد هەزارو دوسەد هەزار ئەکرد ، کە معلومە ئەمەی لەمالی ئەم موسولمانانە پێکەوە ناوەو ئەم عالەمەی خستۆتە سەر ساجی عەلی ، بوە بە باعسی چەند هەزاران مخلوق کەچی ئێستا بە چ ڕویەکەوە جسارەت ئەکات ، ئەم نوعە قسانە ئەکاتو ئەم مەلا موبارەکانەش چەند گورجو گۆڵ بێ گرێو قۆرت ئەم فتوا ناحەقەیاندا ، هیچ بیریان لەوە

نەکردەوە ئەم خەڵقە بە ڕەنجی شانو عەرەقی ناوچەوان خوێنیان بوە بە ئاو ، هەتا ماڵو حاڵێکیان پێکەوە ناوە ، ئێمە بە چ حەقو شریعەتێك بڵێین بەجارێ لە دەستیان وەربگیرێو بدرێ بەم ظالمو خوێن خۆرە بێ انصافانە •

وتم ( ای خالق ، ای منتقم ای قهار ، ای عالم الغیوب ) تۆ چی لەمانە ئەکەیت ، ئەمانە لە ڕۆژی خۆیدا چۆن حسابیان ئەبینی ، تۆ لە حەقی ئەمانە چی ئەکەیت ؟ ئاخۆ لە دەفتەری محکمەی گەورەی تۆدا گوناحێکی تری وەکو ئەمە قەید کراوە یان نا ؟ تۆ بۆ ئەمانە چ نوعە جەزایەك دائەنێیت ، تۆ چۆن ئەم حاڵانە قبول ئەکەیت مەگەر هەر بحری بێ‌بنی حیلمی تۆ ئەمانە قوّت بدا ، تۆ چۆن ئاگر ناباڕێنی بەسەر ئەم قومەدا ، تۆ ئەو غضبەت کە وەکو ئاگر وایە بۆچی بۆ ئەم تاقمە نایەتە جۆش ، تـۆ بۆچی هەر ئێستا ئەمانە بە ناخی عەردا نابەیتە خوارەوەو حەقی ئەم میللەتە قوڕبەسەرەیان لێ ناسێنی • ئەی وجدان ، ئەی انصاف ئێوە کە ناوتان هەیە بۆچی ئێستا ناچنە صورتی انسانەوەو بێن یەکی چەپۆلەیەکی زل لە سەرو چاوی ئەمانە بنێنو محویان بکەنەوە ، آی ••• آی ••• آی •••

روانیم هیچ شتێك نیەو هیچ پەیدا نەبۆ ، منیش هـەروا وەستام لە جێگای خۆم وشك بوبوم ، ئەوان هەر قسە ئەکەن ، منیش لەبەر خۆمەوە هەر ئەڵێم پەح •• پەح •• پەح ئەمە چی‌بو من دیم ، من لـە کوێم ، ئەمە خەوە یان نا ؟ بۆیە هەردو چاوی خۆم گلۆفت وتم بەڵکو ئـەگەر خەوە خەبەرم بێتەوە • کەچی ڕوانیم هەمۆ شتێك هەر لە جێگەی خۆیەتیو ئەو جانەوەرانە هەر لەبەر چاومن ، هەمۆ لەشم لە تاوا هاتە لەرزینو دڵم کەوتە کوتەکوتو سەرم گێژی خوارد ، لە پڕێکا گرم بە دەما کەوتم بە عەردا ، لە ئێشو ئازاری کەوتنەکە هۆشێکم هاتەوە بە بەرداو هەستامەوە بیرێکم کردەوە وتم ئەمانە فائدەیان نیە با بزانم چی ماوە ببینم • هەستام وردە وردە چومە پێشەوە گوێم گرت ، هەر قسەیان ئەکرد بەڵام دوایی قسەیان بۆ ، هەر ئەوەندە حاڵی بوم وەکو مەلاکان لە مکافاتی ئەم خزمەتە گەورەیەدا

که کردویانه داوای شتێکیان کردبێو ئەویش وەعدی دابنێ کە بیانداتێ ، ئیتر ئەوان چونە دەرەوە ، لەو ناوەدا ، مەلای بڕنوتی کێش لە دەرگاکەوە گەڕایەوە هاتە پێشەوە وتی : ئومێدم وایە ئینشاالڵا خوا هەر موفقت بکات مادام تۆ ئەوەندە بۆ ئەم دینە هەوڵ ئەدەیتو تێ ئەکۆشیت ، خواو هیمەتی پیران پشتیوانت بن ، ئەویش پێکەنینێکی بۆ کرد ، ئیتر ئەوان ڕۆیشتنو مانەوە خۆیان •

دوای ڕۆیشتنی مەلاکان ئنجا یەکدوائێکی لەو پیاوانــە بانگ کردە پێشەوە ، یەکێکیان کولە بنەیەك بۆ ڕانكو چۆغە لەبەر ، بە گفتوگۆکەیدا وا دیار بۆ ئەمە یەکێکە لە ئاغاواتی ئەو ژورە چونکە قسەکانی وا دیاربۆ کە جیایە لەگەڵ ئەوان ، هەر ئەمیش بۆ لە وەختی فتــوادانەکەدا اعتراضی لە مەلاکان گرت ، یەکێکیتری کەچەڵەی پۆشتەو پــەرداخ ، خەنجەرێکی دەسك ماهیو دەمانچەیەکی باش بە قەدەوە ، ئەمیش هەر ڕانكو چۆغەی لە بەرابۆ ، بەڵام هەر بە زمانی خۆیان قسەی ئەکرد ، هەر ئەمیش بۆ کە بۆ مسئلەی لیرە گۆڕینەوە قســەی لەگەڵ ئەکرد ، ئەم دوانــەی بانگ کردە پێشەوە لەبەردەم خۆیدا زۆر بە ئەسپاییو هێواشتر ، قەدرێکی چاك قسەی لەگەڵ کردن ، بە اطوارو دەست هەڵسوڕاندنو حرکاتەکەیاندا دەرئەکەوت کە ئەمە ترتیباتێکە ئەو بــۆیان دائەنێو بعضێك ئیشــیان پێ ئەسپێرێو ڕێگەیان نیشان ئەدا ، لەم ترتیباتو فسە فسە بــۆم دەرکەوت کە چەند کەسێکی پێ نشاندانو دیاری کردن کە ئەمانە پیاوو زەلامیــان بۆ تعیین بکەنو بیانتێرن بیانکوژن • ئیتر من لەم حاڵانەدا کەوا بە بەرچاوما دێتو ئەڕوا هیچم پێنەمــابو ، هەر ئــەموت یا ربی ئەمــە چیە من ئەیبینم ، من هــەر ئەوەنــدە تێــــگەیشتم کــە ئەیــانوت : چـــوار تفەنــگچی بچێت بۆ سەر فلان لە فلانە وەختا بچنە ئەوێ ،بۆ بعضێکیان کوشتنو بۆ بعضێکیان ترساندنو بریندار کردن دانرا • خلاصە هەتا نزیك سەعات سێ بەم کەینو بەینەوە بۆن ، لە پاشترا ئەوانە هەمۆیان ڕۆیشتن ، هەر گەورەکە

خۆی‌و یەکێکی دانیشتوو یەکێکی ڕاوەستاو لەوێ مانەوە •

## پەردە گۆڕا

ئەمجار یەکێك هاتەژوورەوە ، بە هێواشیکەوە وتی : قوربــان فلان‌و فیسار هاتون چی ئەمــر ئەکەیت ، ئەویش قەدرێك راماو بــیری کردەوە ، بۆڵەییکی لێوە هات ، بە ساردیکەوە وتی :با بێنە ژورەوە • ســەیرم کرد سێ کەس هاتنە ژوورەوە ، هەوەڵەمینیان یەکێك بو کورتە بــاڵا رەنگێکی رەش‌تاڵە ، تازە سمێلی رەش کردبو ، ئەویان لەپێشەوە هات ، گەورەکەیش بە گفت‌و لطفێکی روکەشەوە قیام‌و بەخێر هاتن‌و پێکەنینێکی لەگەڵ کردو لای سەرەوە دانیشت • دوەمیــان یەکێکی‌تر بو کەڵەگەت رەنگ سپی ، بەڵام وەکو هەمۆ لەشی گوشرابێ‌و هەرچی خوێن لە لەشیا بێت دەرهێنرابێت وابو ، بەقەدەر زەڕەیەك سۆری خوێن لە گۆشتیا دیار نەبو ، زەرد زەرد ئەتوت لێمۆیە ، ئەویش بەخێرهاتن کراو دانیشت ، دوای ئەو یەکێکی‌تری کوڵەبنە ، هەڵەشە ، پەلەپەل‌کەر هات ، بە عظمتێکی وشکەوە دانیشت ، ئەم سیانە هەرسێکیان هاتن‌و بەو ڕەنگە دانیشتن ، جگەرەو قاوەو ئەمانە خوراوخورایەوە •

لەپاشاندا اشارەتی خلــوەت کراو دەرگا داخــرا ، گەورەکەو ئەو سیانەو یەکێك لەوانی‌تر کە لەپێش مەلاکانەوە هات‌و لای سەروی گرتبو ( ئەم کابرایە وا دیار بو یان لە هەمۆ دیزەیەکدا ئەسکوێ بێت یاخود زۆر محرەمی گەورەکەبێت بەڵام بەوەدا کە زۆر أهمیەتێکی نەئەدرایە لام‌وایە بە وشکی خۆی خۆی بە گەورە دانابوو خزمایەتی لەگەڵ گەورەکەدا هەبو بۆیە بە ســمێڵێکی نەختێــك فشەوە جــارجارە بە قایــم یەکدو قسەی لاپلەرسەنگی ئەهاویشت ) ئەوە هەر مایەوە • کابرای کوڵەبنەو گەورەکەش هەر وەستابون ، یعنی هەمۆیان شەش کەس لەوێ مانەوە ، منیش وتم بزانین ئەم پەردەیە چە رەنگێکە ، لــەم دانیشتنەدا چەند خوێنی ناحــەق بە فیرۆ ئەڕواو بزانم من هیچ ڕێگەی دەرچون‌و نەجات بۆ خۆم ئەدۆزمەوە •

ئەم جار گەورەکە دەمی هەڵهێنایەوە ، زۆی کـردە خەلقەکە وتی : ئەبێ بزانم چی ئەڵێن‌و چیتان پێیە • لەو سێ کەسە ، کورتە بالآکەی کە لە ئەوەڵەوە هاتبوە ژورەوە وتی : ئەڵێین کە مصلحت بۆ تۆ وایە لەگەڵ تورکدا رێك‌بکەوی‌و بە ئەمرو قسەی ئەوان هەڵسوڕێیت ، بنێری بەشوێن ئەواندا کە بێن لێرە دانیشن ، ئەوسا ئێرە بەتەواوەتی بۆ تۆ ساغ ئەبێتەوەو شکڵی حکومەت ئەگرێ ، ئەوسا تۆش ئەتوانی لەگەڵ ئەوان بەرامبەر بە دوشمن هەمۆ شتێك بکەیت ، کە ئەوان بـۆن بە پشتیـوانت جێـگەو موقعی تۆ گەورەترو محکم ئەبێ ، کە تۆ لەگەڵیاندا رێك‌کەوتی‌و ئەوانت هێنایە ئێرە ئەوسا ئەوانیش مجبور ئەبن لەسەر تۆ شەڕیش بکەن‌و ئیشی چاکیشت بۆ رێك‌بخەن • ولآتەکەشمان بە تەواوی بکەوێتە رەحەتیەوە • ئەویش وتی ئاخر قسەکانی ئێوە زۆر باش‌و معقـولە منیش لەلام باشە بـەلآم من هەتا ئێستا غەیری قسە نەبێ هیچی‌ترم لەوان نەدیوە ، فعالیاتێکیان نیە ، ئەوان بە چوار عەسکەری رەش‌و رۆت‌و برسیەوە هاتون هەر خەریکی راوو رۆت‌و خلق روتاندنەوەن ، نە عەسکەرێکی رێك‌وپێك‌و نـە ارزاق‌و مهماتێکیان هەیە ، ئەوان هەر پارە کۆئەکەنەوەو خۆیان ئەژێنن ، ئیشەکانیان هیچی لە هی حکومەت ناچێ • من بە چ شتێکی ئەمانە پشت ئەستـور ببم‌و چۆن لەگەڵیان رێك بکەوم‌و أمنیـەتیان پێ‌بکەم • ئەمجا کابـرای رەنگ زەرد هەڵیدایـە وتی : قوربان ئەمـە تـۆ چی ئەفـەرمویت ، ئەمـەش نەوعە سیاسەتێکە کە ئەوان ئەیکەن ، ئەمە لەبەر أجنبی‌و قسەی دوازۆژە بەم‌رەنگە هەڵئەسوڕێن ، ئەگینا ئەم حرکاتانە هەمۆی بە أمری ( انقرە )یە ، دەقیقە بە دەقیقە ئەمر لەوێوە وەرئەگرن ، استقلال بێ‌و أمتیاز بێ‌و مختاریەت بێ ، هەر ئەوان بیدەن بۆ هەمۆمان مصلحتە ، ئەگەر بێتو لەگەڵ ئەواندا رێك‌نەکەویت ئەوە محققـە فەلاکەت بەسـەر خۆت‌و میللەتەکە ئەهێنیـت ، ئەگەر بەم قسانەی من باوەڕ ناکەیت ئەوە قاقەزی رەسمی ( دەستی کرد بەم باخەڵ‌و بەو گیرفانیا بعضێك قاقەزی شـڕی دەرهێناو سەیری کـردن‌و هینی ئەم

باخەڵی خستە ئەو گیرفانیەوەو نەختێك خۆی خەریك كرد ، دوایی دەستی دا بە دەستاو بە ناخۆشیەكەوە وتی : ئا وەڵڵا نەمهێناوە ) ٠

كوڵەبنەكەی لای خوارو كە دانیشتبو بە دەنگێكی نوساوەوە كەوتە جوڵەجوڵ وتی : یاخوا بێقەزابی ئەمە ئیشە تۆ ئەیـــكەیت ، ئاخر چەندم عەرز كردی لەبیرت نەچێ ، ئەویش وتی : دەسا چیبكەم وا لەبیرم چوە خۆ ئێـــوە بـــە چـــاوی خۆتـــان دیوتانـــەو خوێندوتانـــەوە ، ئـــەوانیش بە جوتـــە وتیـــان آخـــر بـــۆ ئێـــستاش لازم بـــو كـــە ئـــەمیش بیبینێ ، وتی : قەید ناكات بەڵام بۆ جارێكیتر هەر ئەیهێنمە خزمەتی خۆشی كە بیخوێنێتەوە ، ( انجـــا كە عیان چ حاجت بـــە بیان ) ئەمـــە مسألەیەكی ئاشكراو دیارە بە بەرچاوەوە هیچ كاغەزیش نەبێت ، هەر ئەمە ڕێگەیەكی ڕاستو ڕونـــاكە ، ئایا لە نقطـــەی دیانت ئایـــا لە سیاستدا ، یا لە هەر خصوصێكیترەوە كە بیخوێنیتەوەو بیگرێ ، لەمە زیاتـــر چارە نیە ، پەناو پشتیوانی ئێمە هەر توركەو تورك ٠٠٠ باوكو باپیرە گەورەمان هەر لەگەڵ ئەواندا بـــون ، خۆشمان هەر پـــەروەردەی دەستو تربیـــەی ئەوانین ، گەورەمانو صاحیبمانن ٠ خلاصە ئێمە لەگەڵ ئەواندا نەبێ ناژینو ادارە ناكەین ، ئەوان أسلامو ئێمە أسلام ، ئایا بە حسب دیانەتـــەوە وە یاخود بە حسب شتیترەوە بێت ، هەر ئەوان چاكن ، قسە هەزارەو دوانی بەكارە ، ئێمەو توركیان وتـــوە ، ئەگینا ئێمە چـــۆن لەگەڵ حكومـــەتی ئینگلیزدا هەڵئەكەین ، ئەوان لەپاش دوۆ سێ ساڵ ئەمانخەنە سەر ساجی عەلی ، هەمو چیوی سواڵمان ئەدەنە دەست ، كەس كەس ناناسێت ، هەركەسە بۆ خۆی گەورەی خۆی ئەبێ ، گەورەو بچوكی نامێنێ ، قەدرو اعتبار لەناو ئەچێ ، ئەمڕۆ ئەم وڵاتـــە كە هەر جنـــابت ئەناسن ، ئەوســـا كەس هـــەر ئاوڕت لێناداتەوە ، تۆ چیتو من چیم ، گەورەكەش لەم قســـانەی كە بە دڵی بو ، زۆر متأثر بو ، وتی : راستە منیش باوەڕ ئەكەمو ئەزانم كە وایەو بۆ ئێمە هەر ئەمە چاكەو لەوە چاكترو باشتر چارەیەك نیە ، بەڵام ئێستا ئەڵێن تورك

ئەو تورکە نەماوە کە ئێمە دیومانە ، ئێستا ئەوان دەخلیان بەسەر دیانەت‌و شەریعەتەوە نەماوە ، خەلافەتیان هەڵگرتوەو خەلیفەیان دەرکردوە ، هەرچی اداب‌و ئایینی ئیسلام هەیە هەمویان وەرگێڕاوە ، شێخ‌و مەلایان هەمو دەرکردوە ، تەکیەو مزگەوتیان داخستوە ، ژن‌و پیاو پێکەوە لە چایخانەو مەیخانە سەربەست هەڵئەستن‌و دائەنیشن ، شەبقەیان لەسەر کردوە ، قرآنیان ترجمە کردوە بۆ تورکی ، مسئلەی طلاق‌و نکاحیان گۆڕیوە • کەوابو فەرقی ئەمان‌و ئەوان چیە ، بگرە أجنبیەکە چاکترە • ئەمجار هەرسێکیان هەڵیان‌دایە بەپێکەنینەوە وتیان : قوربان هەڵبەت تۆش بەم پڕوپاگاندانە باوەڕت کردوە • ئەم قسانە غەیری بوختان‌و درۆ نەبێ هیچی‌تر نیە ، خۆ شکور جنابت دنیات دیوەو لە سیاسەت ئەزانی ، ئەمە گوایە بەم قسانە فکری خەڵق لە حەق تورك ئەگۆڕن‌و تێکی‌ئەدەن ، ئەگینا بە هەمو شتێك تأمینت ئەکەین کە ئەم قسانە هەموی أفترایەو بێ أصلە ئەگەر دین‌و اسلامیت بێت لای ئەوانە ، تۆ چۆن ئەبێ باوەڕ بەم قسانە بفەرمویت • ئیتر کابراش بەم قسانە لەوبارە هاتە سەر بارێکی‌تر ، بە هاژەو هۆشەی ئەمانە تەواو بڕوای کرد وتی : کەوابو با ئێمە یەکێك بنێرین بۆلای ئەوان کە مذاکرەو گفت‌وگۆیان لەگەڵدا بکات‌و قرارێکی قطعی‌و قول‌و تعهدات تەواو وەربگرێ ، رێگەو دام‌و دەزگا بۆ ئێمە دابنێن بە نوعێکی‌وا کە بۆ ئێمە چاك بێت ئەوە بەو جۆرە باشەو منیش بەم رەنگە زۆرم پێ خۆشە ، هەرچەندە ئەترسم ئەم جارەش بێ فائدە بێ چونکە ئەمە سەری چەند جارەیە کە پیاو ئەنێرین‌و بێ‌فائیدەیە ، ئەمجارە ئەبێ بە رەنگێکی‌واو یەکێکی‌وا بنێرین کە بێ‌نەتیجە نەمێنێتەوە • ئەوانیش وتیان ذاتاً مقصدی ئێمەیش ئەوەیە کە یەکێکی تێگەیشتوو راست‌و پاك بچێ‌و موافقی مطلب مسئلەکە ببڕێتەوەو جوابی قطعی بهێنێتەوە با ئەمجاریش وەکو جاران نەبێت •

ئێستا وا فلان حازرە ( زۆیان کردە کولەبنەی دەنگ نوساو ) ئەویش

هەستایە سەرپێیان وتی بەڵێ من حازرم ، ئەفەرمون لە سبحەینێ زوتر نیە من ئەڕۆمو هەر چۆنێك ئارەزو ئەکەنو قراری ئەدەن ئەیبڕمەوە • دوانەکەی تریش وتیان زۆر باشــە لازمــە لــەم خصوصــەوە چی پێویســتە ئــەو شرایطـو قولو قرارە بنوسرێتە کاغەزو بیبەیت لەگەڵ خۆت ، گەورەکەیش وتی باشە • روی کردە کابرای زەردە وتی تۆ کاغەزێکی باشو درێژ بنوسە لەم خصوصەوە زۆر بەدقەتو بیهێنە من امضای ئەکەم ، ئەمیش حازربێت هەتا دۆ ڕۆژی‌تر بڕوات ، خوا حافظی بێت • لەپاشان گەورەکە ڕوی کردە کابرای کە لــە أولی مجلسەوە هاتبــو لای سەروی گرتبــو وتی : تۆ لەم خصوصەوە چی ئەفەرمویت ئەویش وتی : هەرچۆنێك ئێوە لاتان باش بێت ئەوا منیش لام باشە • کوڵەبنــە کەچەڵەکەی لای خــوارەوە وەستابو ، ئەویش هەڵی‌دایە وتی : بەخوا شت لەمە باشتر نابێ • ئیتر لەسەر ئەمە قرار دراو گەورەکە بــە دڵو دەروێکی صافو بێ‌گرێــوە وتی : لە سبحەینێ زوتر نیە کاغەز بنوسرێو کابرایش سبحەینێ بەخێــر بڕوا • ئیتر ئەوان بە رویەکی پێکەنیناویو دڵێکی خۆشەوە هەستان ڕۆیشتن ، مایەوە گەورەکەو کابرای کە لە ئەوەل مجلسەوە هاتبو لەگەڵ کوڵەبنەی کەچەڵەکە ، ئەمجار گەورەکە وتی : ئێستا واباشە بزانین ئەمجارە ئیش چۆن ئەبێ ، کابــرای کوڵەبنەی کەچەڵە وتی قوربان سەری تۆ خۆش بێ هەر باش ئەبێو ئەبێ باش بێــت ، کابرای‌تریش وتی : ئومێــد وایە هەر بــاش بێ ، لەپاشاندا گەورەکە کوڵەبنەکەی بانگ کردە پێشەوە بەهێواشیێکەوە پێ‌ی‌وت : تۆ ئێستا بچۆ ئەو پیاوانە حازر بکە ، مەیەلە کەس پێ بزانێت ، لەماڵی خۆتان دایانبنێ ، تەمیەیان بکە کە نەیەڵن کەس پێ بزانێو خۆت لەگەڵ فلاڵندا ترتیباتیان بۆ دابنێن هەتا جێبەجێ ئەبن • ئیتر چونــکە نەختێك بە چرپە قسەیان ئەکرد ، هەمو قسەکانیانم گوێ لێ نەبو • دوایی کوڵەبنەکە وتی : قوربان سەری تۆ خۆش بێ هەرچۆنێك ئەمرو ئارەزوی تۆ بێت وا جێبە جێ ئەبێت ، ئیتر ڕۆیشت بۆ دەرەوە •

## پەردە وەرگەڕایەوە

ئەمجار مانەوە خۆیو کابرای ئەوەڵ بەجوتە ، ئەمە لەم قسەو باسانەدا ژنەکان لەپشتەوە کە هاتون گوێ ئەگرن ، هەر ترپو هوڕ دێنو دەچن ، قسەکانی ئەوان ئەبەن بۆ ناو ژنەکانو بە فسەفس ئەیگێڕنەوە ، منیش هەر لە جێگەی خۆم وشك وەستاوم ، وتم : ئەمە سێ پەردە گۆڕا ، یەك لە یەك ناخۆشترو خراپتر ، ئەم کابرایە چ نەوعە انسانێکەو ئەوانە چ دەعبایەکن ، با بزانم دوای ئەمیش چی ئەبێ • لەپاش نەختێك کابرایـەك هاتە ژورەوە ناوی یەك دۆ کەسی برد کە هاتون بۆ حضور ، چی ئەمر ئەکەیت ؟ ئەویش بە پێکەنینەوە روی کردە کابرای تەنشتی وتی : سەیرە •• با ئەوانیش بێن ، با بزانین ئەوان ئەڵێن چی ، ئەمجا ئەمری کرد وتی : با بێنە ژورەوە • ڕوانیم لەپاش تۆزێك دەرگا کرایەوە ، سێ کەس هاتنە ژورەوە ، یەکێکیان قۆڵی لە عەبا هەڵکێشابو بە کشو فشێکەوە پێش‌کەوت ، گەورەکەش فەرمـو فەرموی بۆ کرد بە بەگم فەرمو فەرمو جێگەیەکی پێ نیشاندا ئەمری کرد بە دانیشتنی ، ئەویش بە ئەدەبەوە دانیشت ، لەدوای ئەوەوە یەکێکی‌تر هات چاکەتو پانتۆڵی لەبـەردا بو قیافەتەکەی لە قیافەتی عەسـکەری ئەچو ، ئەویش جێگەی نیشان دراو دانیشت ، ئەمیش نە زۆر کەڵـەگەت بو نە کورت ، نە لەڕ بو نە قەڵـەو لە عمری چلساڵیدا دیار بـو ، لەپاش ئەو یەکێکی‌تر هات لە قیافەتی تجارا بو •

لەپاش هەمویان کابرای کە سەر لە بەیانی لە دەرگای حەوشە ئەمری کردو منی لەگەڵ خۆی هێنایە ژورەوە ئەویش هاتو بە پێیانەوە ڕاوەستاو دەرگاکەیان داخسـت ، بە گەورەکـەوە شـەش کەس مانـەوە ، منیش لەبەرخۆمەوە وتم با بزانم ئەمجارە چی ئەبێتو لـەم مجلسەدا چی پەیدا ئەبێ ، دواجار دیسان اشارەتی خلوەت کرایەوە ، کابرای بەپێیانەوە چوە ئەو دیوی دەرگاکەوە وتی کەس نەیە بەم دەورەدا ، بەڵام ژنەکان لەودیوەوە هەر فڕکە فڕکیانە دێنو دەچن ئەمجار لەپاش خۆشو بیشو ئەمانە کابرای

که له هەوەڵەوە هاتبوە ژورەوە کەوتە قسە کردن ، ملی لێ هەڵبڕیو که قسەکانی ئەکرد چاوی لێ دەرئەپەڕی بەهێزو قوەتێکەوە قسەکانی ئەکرد ، ئەموت ئێستا توشی شتێك ئەبێت ، هەردو دەستی بەملاو بەولادا ئەسوڕایەوە ، ئەیویست ئەو قسانەی هەمتوی بێ ئەوەی دەنگی لێ بڕژێو لەناوبچێ بیخاتە مێشكو دەرونی خەلکەکەوە ، قسە کەوتە سەر باسی سیاسەتی تورکو انگلیز ٠ روی کردە گەورەکە وتی قوربان ئێستا ئیش بە رەنگێکیوا دیاری داوە کە منداڵی ساوایش تێ ئەگاو ئەیزانێت ئەم میللەتەو ئەم وضعیتە بێ ئەمەی حکومەتی ئنگلیز دەستی بەسەرا بکێشێو پشتیوانی بکات ناژیو سەرناگرێ ٠ ئەگەر ئێمە ئومێدێکمان بە بونی خۆمانو سەربەرزیو گەورەیی ولاتەکە بێ ، هەر بەواسطەی حکومەتی ئنگلیزەوەیە، ئێستا کەوا ئێمە هەوەڵی ئیشمانەو چاومان لە روناکی پاشەرۆژمانە ، دیارە خۆمان لە خۆمانەوە هیچمان بۆ پێك نایەتو سەرناگرێ چونکە نە ثروەتو نە صنعتو نە تجارەتو نە هیچێکیوامان هەیە کە خۆمانی پێ بژێنین ، لەبەرئەوە ئێمە معینو پشتیوانێکمان ئەوێ کە ئەویش مەگەر هەر حکومەتێکی گەورەو بەدەستو دەوڵەمەندی وەکو ئنگلیز بێ ، ئەمجا روی کردە پیاوەکەی تەنشتی ئەوی چاکەتو پانتۆڵی لەبەرا بو وتی : بابە وایە یان نا ؟ ئەویش دەمی کردەوە دەستی کرد بە قسە کردن وتی : ئێمە ئەگەر تەماشای قانزاجی عمومی تۆو هەمتو میللەتەکە بکەینو دوارۆژی خۆمان بخوێنینەوەو سەربەخۆ ئیش نەکەین ، چارە هەر ئەمەیە بە أصولێکی معقول لەگەڵ حکومەتی ئنگلیزدا ڕێكبکەوینو ئەمینم حکومەتی ئینگلیزیش زۆر شتی باش بۆ ئێمە ئەکات ، خۆ ئەگەر بێتو ئێمە ئومێدو ئەمەلمان بە تورك بێ ، ئەوە سەهویەکی زۆر گەورەیە ئەیکەین چونکە چەند ساڵە چی بۆ کردوین تا ئێستا بۆمان بکات ، ئەوە نمونەیەکیانە لە بن دەستمانەوە ئەیبینین بە بەرچاومانەوە خەریکی راوروتو تالانو اعانەو خۆ لەوەڕاندنو دەستبڕینی ئەم عالەمەن ، خۆیان لەوانەن کە چاوەڕوانی دەستی ئێمەبن

نەك ئێمە هینی ئەوان • میللەت پێ ناسین‌و سەربەستی‌دان‌و فکری گەورەیی‌و سەربەرزی دان‌و ئەم نەوعە شتانە لای ئەوان نیە • غەیری ( کیسرم بیچرم )و روتاندنەوەو ظلم‌و زۆرو کوشتن‌و بڕین هیچی‌تر بۆ ئێمە ناکەن ، ئەو معاملەیە کە تۆ نەفسی خۆت لەگەڵ ئنگلیز کردت ئەگەر نیوەی ئەوەت لەگەڵ تورکدا بکردایە ئەمین‌بە دە دەفعە اعدام کرابوویت ، تۆ بزانە ئەم بەینە تورك هێشتی کەس بزانێ باسی ملیەت‌و قەومیەت چیەو چی نیە • ثروەت‌و تجارەتێك کە لەم چوار پێنج ساڵەدا بۆ ئەم میللەتە پەیدابو ، بە پەنجا ساڵ لە زەمانی تورکدا پێك نەئەهات ، من ئەمینم ئەگەر جەنابت لەگەڵ حکومەتی ئنگلیزدا ڕێك بکەویت دۆ شەشی ئەم میللەتەیە ئێمە کە میللەتێکین ئێستا محتاجی معاونت‌و ڕێگە پیشان‌دانین‌و مللەتێکی اسلامین ، بەم حالەوە محقق‌و دیارە لەگەڵ تورکدا بە هیچ ڕەنگێ پێکەوە ناژین ، تورك ئێستا ئەو تورکەی پێشو نەماوە کە ئێمە دیومانە • نە دین‌و نە ئایینیان لانەماوە ، ئەگەر ئنگلیز دەخلی نیە بەسەر دیانەت‌و ئادابی میللەتێکەوە ، بەخوا تورك نایەڵن بە هیچ ڕەنگێك شتێك بڵێین ، نە رعایەتی دین‌و نە حورمەتی آداب‌و ئایین نامێنێ ، علماو مشایخمان بێ قەدرو بێ حورمەت ، کەس لێیان ناپرسێتەوە ، ئەوی بە دەسیشمانەوەیە هەمۆمان لێ وەرئەگرنەوە ، عەسکەرو تکالیفی حرب‌و أعانەو أنواع خەرج‌و باج ، هەر بەمانە ماڵمان بە قوڕ ئەگرن ، بەڵام حکومەتی ئنگلیز وا نیە ، ئێمەش بەڕێوە ئەباو دەوڵەمەندمان ئەکات ، خۆشی خێرو قازاجمان لێ ئەبینێ ، ئێمە ئەگەر خۆمان تێ‌گەیشتنمان بێت‌و صاحب هۆش‌و شعور بین‌و هەوڵ‌و تەقەلا بدەین‌و بە عەقڵ‌و معرفەت بێینە پێشەوە ڕەنگە لەپاش مدەتێکی‌تر بۆ خۆمان حەقێکی گەورەو جێگایەکی باشمان دەست‌کەوێ ، ئەمجار جەنابیشت ئەم قسانەی من ورد بکەرەوەو محقق بزانە قسەکانم هیچیان بۆ أمل‌و غرضی شخصی نیە ، محضا بۆ منفعت عمومی قسە ئەکەم ، ئەگەر خۆشتان بە مصلحەتی ئەزانن ئەوا بۆ ئەم خصوصە قرارێك بدەن با

ئیتر بکەوینە رەحەتیو سەربەستیەوەو ئەمینم ئەمڕۆ ئەگەر جەنابت لەگەڵ حکومەتی ئنگلیزدا رێك بکەویت جێگەو مقامێـــك کە ئەو بیدا بە تۆ هیچ حکومەتێکیتر ناتداتیو هەر کەسێکیتر نەوعە قسەیەکیترت عەرز بکات محققە یان بۆ أملی شخصیە یان مقصدی ئەوەیە فەلاکەت بەسەر جەنابتو میللەتەکە بهێنێت ، ئەمەش خوا قبولی نیە ، انسان بەخوتو خۆڕایی بـــە دەستی خۆی ، خۆی بخاتە تهلکەوە ، ڕێگای رونائو راست بە بەرچاوەوە لە پێشمانەوەیە بۆچی لادەین • دۆ کەسەکەیتریش کە رەفیقی ئەم پیاوە بون ئەوانیش دەستیان کرد بەم نوعە قسانەو چەند نمـــونەو میثالێکیان بۆ هێنایەوە وتیان : ئەوە میصر ، ئەوە عیراق ، ئەوە هندستان •

خلاصە بەم قسە مێچکە مێچکانە وایان لێکـــرد ، کابرایان لەم بارە بردە سەر بارێکیتر ، هەمۆ فکرو قسەکانیانی تصدیق کرد • وتی منیش باوەڕم هەیە کە ئەمە وایە بەڵام ئێمە چەند وەختە لەگەڵ حکومەتی ئنگلیز خەریکین ، ئەو بە تەواوەتی ڕێك ناکەوێت ئێمە چیبکەین ، ئەوانیش وتیان ئەمە خەریك بون نیە لازمە بە صورتێکی معقولو باش چەند ماددەیـــەك بهێنرێتە قەڵەم بە نەوعێکیوا نە شیش بسوتیو نە کەباب ، بۆ هەردولا باش بیو دەست بدا ، هەردولامان قانزاجی لێ ببینین ، ئەوسا بزانە ئەویش قبولی ئەکات یان نا ؟ ئەگەر ئەفەرموی بـــا چەند کەســـێکی تێگەیشتوو بچن بۆ بەغدا ، لەوێ قســـەی لێ بکەنو قولو قرارێکی بـــاش بدەنو لەگەڵیا رێ بکەوین ، بەڵکـــو ئینشاللا هەمۆ لایەك لە ســـایەی جەنابتانەوە بکەوینە خۆشیو رەحەتیەوەو بحەسێینەوە • وتی : منیش زۆرم پێخۆشە و حەزی پێ ئەکەمو ئەمەم لە هەمو شتێك پێ باشـــترە • ئێوە خۆتان ســـبحەینێ لە جێگایەك گرد بینەوەو چەند ماددەیەك بنوسن کە وەکو ئەڵێن بۆ هەردولا باشبێت • ئەوسا یەکدو کەسی تێگەیشتوو هەلبژێرینو بیاننێرین ، ئەگەر وابێت ، گوایە من چۆنی پێ ممنون نابمو بۆچی پێم باش نەبێ • ئنجا ڕۆی کردە کابرای سمێڵفش کە لە ئەوەڵی هەمۆ مجلسەکەوە هاتبو لای سەروی

گرتبو ، وتی : تۆ ئەڵێی چی ؟ وتی بەخوا باشە ، ئەم قســەیە زۆر جوانو معقولە ئیش لەمە باشتر چۆن ئەبێ ، خێری پێوە بێت ، ئەمە لە هەمو شتێك چاكترە • بە هەمویان لەسەر ئەمە قولو قراریان بەست ، لە پاشان ئەوانیش هەستان بە ممنونی ڕۆیشتن • لە وەختی ڕۆیشتندا گەورەكە ڕوی كردە ئەو پیاوە كە قیافەتی چاكەتو پانتۆڵ بو ، وتی زاتا دەمێكە ئەمەت ئــەوێ ،تۆ خۆت انگلیزی ، بەلاّم بە پێكەنینەوە پێیوت وەكو گاڵتەی لەگەڵ بكات، ئەویش وتی قوربان كەسمان ئنگلیز نین بەلاّم بۆ خێــرو مصلحتی خۆمانو تۆیشو میللەتەكەیش ئەگەڕێین ، ئیتر ئــەوان پشتیان هەڵكردو ڕۆیشتن ، ئەمیش بە هێواشی سەرێكی ڕاوەشاندو چاوێكی لە پیاوەكە مۆڕ كردەوەو لەژێر لیۆەوە پرتەو بۆڵەبێكی كرد تێنەگەیشتم چیوت •

## پەردەیێكیتر

مایەوە خۆیو كابرای ســمێڵ فشو كابرای كە ســەر لە بەیانی منی لەگەڵ خۆی هینایە ژورەوە ( دان ئالتون ) گەورەكە هەســتا بە ژورەكەدا تۆزێك سوڕایەوە ، بیرێكی كردەوە وتی : ئەمیشمان وا ، ئەوانیش وتیان : بەڵێ • ئەویش پێكەنی وتی : كورە بە خوا من گاڵتەم بەمانە دێت، ئەوانیش وتیان سەری تۆ خۆش بێت ئینشەللاّ هەمو شتێك چاك ئەبێ ( وەكو چاكیەتی دنیا بەسترابێت بە سەری ئەوەوە ) • لەپاشــا گوێم گرت لەدەرەوە هەرا هەراو دەنگە دەنگ پەیدا بو ، گرمو هورو قاوو قیر ، وتم : ئاخۆ ئەمە چی بێت ! روانیم دەرگاكە كرایەوە ، چەند كەسێك هاتنە ژورەوە ، بعضێك بە عەبای ماوێ شینو فەقیانەی سپێ درێژ ، سەرو پێچی زل ، گولنكەی چەفتە هاتۆتە خوارەوە ،كاكۆل بەلای ملیاندا شۆڕ بۆتەوە، لە خەنەو وسمەدا مۆر بوە • بعضێكیتر شەرواڵو مرادخــانییان لەبەر كردبو ، پشتێنی شاڵیان بەستبو ، چەفتەو مشكی زوریان تێك ئاڵاندبو ، هەمو چوار ریزو پینج ریز فیشەكیان لە خۆیان دابو ، خەنجەرو دەمانچە بەقــەدەوە ، هاتن دانیشتن

دەستیان کرد بە قسەی هەلەق‌و مەلەق ، یەکێك ئەیکوشت، یەکێك ئەیبری، ئیتر مەپرسە لەبەرخۆمەوە وتم ولولولولولولو ... ئەم دەعبایانە ئێستا دنیا ئەروخێنن ، یەکێك دەستی خستبوە سەر مشتوی خەنجەر ، یەکێك دەستی بە دەستکی دەمانچەوە ، شایان بە سەپانی خۆیان نەئەزانی .

ورده ورده کەوتنە قسەو گفتوگۆ ، لەپاش چەند قسەیەك گەورەکەش گورج‌و گۆڵ فکری گۆڕاو هاتە سەر قسەی ئەوان ، کەوتنە سەر باسی أدارەو سیاسەت‌و حکومەت ، بەم نوعە قسانە کردیان بە قیرەو هەرا وەك حەمامی ژنان بۆ بە قاو و قیژ کەس نەیئەزانی ئەڵێ چی ، هەرکەسە لەبەرخۆیەوە قسەی ئەکرد . وتیان : ئێمە هەمو بۆچی چاکین‌و بەکەڵکی چی دێین ، ئەمە چەند سالە عومرمان رابواردوە ، ئیتر ژیانمان بۆ چیە نامانەوی ، یان ئەبێ هەمو خۆمان بدەین بەکوشت ، یان ئەبێ هەر خۆمان بین ، جارێکی‌تر خۆمان ناکەین بە ژنی کەس ، هەر سەری تۆمان بۆ خۆش بێ ، ئیتر چاومان لە کەس نیە ، بەخوا نە تورك‌و نە ئنگلیز نایەڵن ئێمە بە رەحەتی‌و سەربەستی دانیشین ، تورك بێ ( ممد أوغلی )یەکانیان(١) ( أیشك کەرەتەو هەریف )مان لێ ئەهێننە پێشەوە ، هەر نایەڵن چاومان بکەینەوە ، بە سەرو ماڵمانەوە بەشی اعانەو مبایعەو اعدامی ئەوان ناکەین . ئنگلیز بێن شەبقە بەسەر ، سەبیلێك ئەگرن بەلای دەمیانەوە ، صاحێب صاحێب ، ئەبێ تەشییان لەبەردا بڕێسین . فەکن فەکنمان لێ دائەنێن ، کەسمان ناتوانین پەل ببزێوین ، کەوابو نەوەڵلا هیچمان ناوێ ، هەر خۆمان بین‌و ئەبێ هەر خۆمان بین‌و دەستی کەسمان بەسەرەوە نەبێ . یەکێك لەلای خوارووەوە وەستابو وتی باشە ئێمەیش هەمۆ پێمان خۆشە کە هەر خۆمان بین‌و دەستی کەسمان بەسەرەوە نەبێت . بەلام ئێستا ئێمە خۆ بەخۆیێ

---

(١) مەمەد ئوغلی ( کوڕی محمد ) مەبەست لە تورکەکانە .
ایشك کەرەتە واتا بێعەقلی کەر . هریف قسەیەکی تورکیی سوکە .

خۆمان اداره ناکەین‌و خۆمـــان پێ بەخێو ناکرێ ، حکومـــەتێکی گەورە لازمە یارمەتیمان بداو چاودێریمان بکات ، ئەگینا زەحمەتە هەر لەملاولاوە قوتمان ئەدەن‌و ئەمانخۆن • ئەوانیش وتیان کەس ناتوانێ بمانخوا ، خوا یار بێ ، تورك بێ ، انگلیـــز بێ هەرکامێـــکیان پەلامـــارمان بـــدەن کلاّو کلاّوێنەیان پێ‌ئـــەکەین ، هێشتا ئەوان شێری جەنـــگەلی کوردوستانیان نەدیوە ، تەیـــارەو تۆپ‌و مەترالیـــوزی ئـــەوان لای ئێمە پەشـــمن ، ئێمە خزمەتکارێ کەس ناکەین ، سەری ئەمەمان بـــۆ خۆش بێ ( ئەمۆستیان بۆ گەورەکە ڕاکێشا ) ، بە هیمـــەتی مشایخان کارێك ئەکەین لـــە هەمۆ دنیادا دەنگ بداتەوە •

ئیتر هەریەکە لە ئاوازێك لەمچەشنە قسەو هاژو هوژانەیان هەڵڕشت • گەورەکەش بەرەبەرە هاتە سەر قسەی ئەوان وتی : بەخوا ئەگەر ( بەد )ی ناوخۆمان لێمان بگەڕێن ، ئێمە بۆخۆمان زۆر چاك ئەژین ، ئەگەر دنیا ببێت بە ئاگری سۆر ئیـــدارە ئەکەین • مـــن قەترەیە خوێنم هەیـــە بۆ ئەم ئیشە ئەیڕێژم یان ئەوی بمانەوێ ئەیسێنم • ئەوانیش هەمۆ لەخۆشیاندا کەوتنە جولەجوڵ وتیان : قســـە هەزارەو دوانی بەکارە ، قســـەی ڕاست‌و حەق ئەمەیە • هەرچی محمـــدیە محمد صلوات ، هەرکەس شـــتێکی‌ترت عەرز بکات ، ئێمە لەکوێ‌و ئەسیری لەکوێ ! ئێمە ئەبێ لەسایەی تۆوە سەربەست بژین ، هەرکەس لەگەڵمان ناکات وای بە حاڵی ! !

لەگەڵ ئـــەم قسانەدا هەندێـــکیان جارجـــار فەقیانە ســـپێکانیان لێ هەڵئەکردو قۆڵیان لێ هەڵئەمالی ، هەندێکیان دەستیان بۆ دەمانچەکانیان ئەبرد وەکو دوژمن بەرامبەریان ڕاوەستابێ‌و پەلامار بدەن ، چاویان لێ سۆر بۆبو ، منیش لە ژورەوە هەروا وەختـــەبۆ زراوم بچێ ، وتم ئێستا پەلاماری دارو بەرد ئەدەن‌و ئەیکەن بە هەرا •

خلاصە ، ئاخری بە هەمویان قراری ئەوەیان دا کە هیچ حکومەتێك

قبوڵ نەکەن ! ! هەر خۆیان بن • بەم ڕەنگە قرار دراو ئەوانیش هەڵسانو ڕۆیشتن • گەورەکە زۆری پێ خۆش بو ، لەپاش ڕۆیشتنی ئەوان مایەوە خۆیو کابرای سمێڵ فش کە لە ئەوەڵی هەمو مجلسەوە دانیشتبو ( کە ئەویش وا دەرئەکەوت ئەم قرارەی ئاخریەی لە هەمو قرارەکانیتر لا باشتر بو )و کابرای کە سەر لە بەیانی منی لە دەرەوە هێنایە ژورەوە • سێ بە سێ مانەوە • منیش زۆر سەرم لەم حاڵە سوڕ مایەوە ، هەروا تاس ئەیبردمەوە ، لەبەرخۆمەوە ئەموت :یارەببی ئەمە چیەو ئەم کابرایە چ انسانێکە ، کە هەر لە زەرفی سێ سەعاتدا ، بە چەند چەشن گۆڕاو بۆچی تۆزێك تێگەیشتنو لێکدانەوەی نیە ، ئەمانە هەموی بەلاوە باشبو لەگەڵ هەمویان قراری داو لەپاش نەختێك لە هەمویان پاشگەز بوەوە •

لەپاشان خۆبەخۆی خۆیان کەوتنە گفتوگۆو قسە ، دوایی گەورەکە وتی : ئەم قسانە هەمو بەلامەوە پەشمنو گاڵتەم پێیاندێت ، من بۆچی بۆ ئەم خەڵکە خۆم تۆشی ئەزێتو دەردیسەری بکەم ، ئەوی قانزاجو خێری خۆمی تیا نەبێ نایکەم ، من هەتا پارەیەکی زۆر نەخەمە سەر یەكو لەبابەت ئیشو کاری خۆمەوە دلم ڕەحەت نەبێ ، ئەمانە هیچیـان ناکەم ، هەرکەسێك بێت بە هەوەسی خۆی ، بۆ قانزاجو کاروباری خۆی قسەیەك بکات ، بۆچی من شێتم ، مناڵـم ، هەروا شوێنیان بـکەومو بە قسەیان بکەم • ئەگەر لێم بگەڕێن هەتا ئیشی خۆم ، وەکو خۆم ئەیزانم جێبەجێ بکەم ئەوا باشە ، ئەگینا من خۆم ئەزانم چی ئەکەم •••

ئەوانەی لە خزمەتـیا بون وتیان : بەخوا ڕاست ئەفەرمـوی ، تۆ مجبوریەتت چیە ، خـۆت بۆ ئەم خەلقـە تۆشی زەحمـەتو نارەحەتی ئەکەیت ، ئەمانە بە چ کەڵکێکی تۆ دێن ، مصلحتی خۆت چۆنە وای بکە ، بە قسەی ئەمو ئەو مەکە ، ئەمانە هیچیان خێرخواهی تۆ نین ! ئیتر من لەم وەختەدا ، نە هۆشم لەسەر خۆم ما ، نە شعور ، بەبێ ئەمەی بزانم من چیمو لەکوێم ، لەخۆمەوە بێاختیار دەستم کرد بە قاقای پێکەنین ، پێکەنینێکیوا

که لەودیوەوە هەمو ڕاچڵەکینو ڕاپەڕینو سەیری یەکتریان ئەکرد ، ئەمە چیەو ئەوە چیبو ... گـەورەکە توڕە بو ، چاوە شـینەکانی دەرپەڕیو وتی : ئەوە کێبو . دوایی کابرای دان ئاڵتون وتی : قوربان ئەوە کابرای حەپسەکەیە کە لەسەر جاسوسیەت گیراوە ، خۆت فەرمـوت لە ژورەوە داینێن ... ئەویش زۆر بە توڕەییەوە دەستەکانی ڕاوەشاندو وتی : حای ، حای . بەخوا باشە ، کەوابو ئاگای لەم هەمو قسەو مذاکرانەی ئێمە بوە ، تەواوە ، ئەمە جاسوسە ، جاسوس لەمە چاکتر چۆن ئەبێ ، ئیتر هەستاو دەرپەڕیە دەرەوە ، بو بە هەراو بگرەو بەردە ، خۆیانو بەردەستەکانیان پێکا ئەهاتن ، کەس نەیئەزانی چیەو چی ئەکات ... منیش ترسام ، وتم : ئای چیم کرد بە خۆم ، بۆچی وام کرد . ئادەی ئەو جاسوسە بێننە دەرەوە . ئەوەندەم زانی دەرگا کرایەوە ، یەك دو زەبەللاح هاتـنو بە پەلکێشان ڕایانفڕاندمە دەرەوە . ڕوانیـم گەورەکە هەردو چـاوی دەرپەڕیوەتە دەرەوەو سورو مۆر بۆتەوە ، ئاگری لێ ئەبارێ . لە دڵی خۆما وتم : یا حافیز ، یا ئەللا ، بۆم بکەیت بمپارێزی لە غەزەبی ئەم پیاوە !

لەگەڵ قیژاندی بەسەرما وتی : ڕاستی بڵێ تۆ جاسوسی کێیتو کێ تۆی ناردوە ؟ زو ڕاستێ بڵێ ، ئەگینا ئێستا بە دار پارچە پارچەت ئەکەم !

منیش شڵەژام ، هەر نەمزانی بڵێم چی ، وتی درەنـگە ڕاستی بڵێ ، منجەمنج مەکە . ئادەی دار بێنن ، ئەو وتی ئادەی دار بێنن من هەمو لەشم هاتە لەرزین ، وتم : قوربان بەخوا ، بەو خوایەی باوەڕت پێی هەیە ، من جاسوس نیمو ئاگام لە جاسوسی نیە ، لای خۆم هاتمە ئێرە کاسبی بکەم ، پیاوێکی هەژارو بێدەستەڵاتم ، بۆ خاتری خوا ناهەقیم لێ مەکەن ، خوا هەڵناگرێ .

هەر ئەوەندەم وت : وەکو شێت شاڵاوی بۆ هێنامو پەلامارێکی دام وەختەبو قوتم بدا ، دانەکانی لێ بردم بە ڕیچا وتی : ئەی جاسوس نیت

چی ئەکەی لەو ژورەدا ، دیارە هاتوی قسەکانی ئێمە بەریتەوە ، وتم : قوربان خۆ من بە هەوەسی خۆم نەچومەتە ئەو ژورەوە ، بە ئەمری خۆت خراومەتە ئەوێ ، من دەسەڵاتم چیە .. ئەمجار دەستی هەڵهێنایەوە بە هەمو هێزو قوەتی خۆی شەپازللەیەکی لێدام ، شریخەکەی دەنگی دایەوە ، هەردو چاوم لە عەزرەتدا بروسکاندی ، سەرم کەوت بە دیوارەکەدا وتی : بەڵێ ، بەڵێ جاسوس نیت بە هەوەسی خۆت نەچویتە ئەو ژورەوە ، بەڵێ جاسوس نیت ! ئا ڕای کێشنە خوارەوە بۆم تا نیشانی بدەم جاسوس چۆن ئەبێ . ئیتر دوشمنی ئیمانت بێ ، هەر ئەوەندەم زانی سەگو گورگی جەهەننەم ، پێنج شەشێ ڕایان کێشام لە پێپیلکانەکان بردمیانە خوارەوە بۆ حەوشەکە . شەویش کردبوی بە سایقە کزەبایەکی ساردی ئەهات ، عەرزەکە بەستبوی ، تەقە تەقی سەهۆلەکە ، سەرمایەکی وایە تف هەڵدەی ئەیبەستێ ! ڕۆم کردە عاسمان وتم : خوایە تۆ لەسەر حەقی ، ئەمانە وا بەناحەق وا بە من ئەکەن ! بەڵام هیچ سودی نەبو ، کڕوزانەوەی من هیچ نەگەیشتە جێی خۆی . ئیتر وەك مەڕی قەساب بە سێ چوارێك گرتمیان ، بە سەردەما بەسەر ئەو سەهۆلەدا ڕایان کێشام ، وامئەزانی سەرمئەبڕن .. ئیتر لە دڵی خۆمدا بەتەمای خۆم نەمام وتم : انا للە ... تسلیمی قضاو قدر بوم . وتم : ئیتر هیچ چارەم نەما ، دەسەڵاتم چیەو چیبکەم ، وا ئەم زاڵمو بێدینو بێ وجدانانە هەر ئەمکوژن ، خوا حەقم بسێنێ ...

ئیتر یەکێك نیشتە سەر قاچم ، یەکێکیتر بەسەر شانمەوە دایانمرکاندمو دامیان بەعەردەکەدا ، لە پەلو پۆیان خستم ، چرچەم بۆ نەکرا ، من ذاتاً ئەوەندەم هێز تیا نەمابو کە پەل بجولێنم ، یاخوا قەت نەیبینی ! ... شلپو هوڕ خۆی بە دار دای گرتم بەتوڕەییو غەزەبەوە ، ئەوەڵ دار کە دایوەشاند ، وامزانی شیرێکی تیژە ئەیکەن بە لەشما ! دامە زریکەو هاوار ، من هاوار ئەکەم ئەو زیاتر دار ئەوەشێنێ ... من لەژێرەوە وەك گا ئەبۆڕێنم ، جوڵەم بۆ نەدەکرا ، چونکە سوارم بوبون ،

دەنگم دەرنەدەهات ، ئەپاڕامەوە ئەلالامەوە : بۆ خوا ، بۆ پێغەمبەر ، تو أصحابان ، تو ملائکان ، تو چاکانو أولیاء ، تو قورآن : تو قەبری باوکت ، هاوار ، داد ، هاوار ••• هیچ سوودێکی نەبو ، هێزم لێ بڕابو ، ئەو هەر ئەیوت ڕاستی بلێ • پڕ بە دەم ئەمقیژان بەخوا جاسوس نیم ، هیچ نازانم ، ڕاستی چی بلێم ئیتر ••• هیچو هیچ(١) •••••



(١) بەداخەوە چیرۆکەکە تەواو نەبوە ، واتە ئەبوایــە لە خەوەکە خەبەری ببوایەوە ... بەلام مەبەستی بەتەواوەتی داوە بەدەستەوە . ئەوەی شایانی باسە ، ئەم چیرۆکە لەکاتی خۆیدا هەوەڵەکەی لە ڕۆژنامەی ( ژیانەوە ) ژمارە ( ٢٩ ساڵی ١ ڕۆژی ١ـ٧ـ٩٢٥ )دا بلاو کراوەتەوە ، هەروەها باقیەکەی لە ڕۆژنامەی ( ژیان )ی ژمارە ( ١ ) ساڵی ( ١ ) ڕۆژی ٢١ـ١ـ٩٢٦و ژیـــانی ژمـــارە (٢٦) ســـاڵی ( ١ ) ڕۆژی ٢٩ـ٧ـ٩٢٦دا بلاو کراوەتەوە .

# ڕۆژەوە بۆ نێك

لەدوایی ئەم بەهارەدا لە بەغدا ئەهاتمەوە ، شەوێك لە کرپچنەوە ، دوو کەس بۆرین سوار ، دوو بارگە بوین لەگەڵ ( قاطرچیەکە ) سەیسەکەدا لە سەگرمەوە هاتین ، دنیا چونکە هیچ جەردەو دزو ... نەبو ، بێ‌ترس‌و لەرز بێ دڵەخورپێ بەڕێ‌کەوتین ، شەو مانـگەشەو بۆ تریفـە تریف ، ئەودیوی سەگرمە دیتە زۆر بەردەڵانی‌و خوارو خێچە هەر لەنیوەی ڕێگاکە من دابەزیم بە هەزار تێو جڕ سەرکەوتم ، کە هاتمە سـەرێ زۆر ماندو بوم ، لە سوچێکی سەرکەژەکەوە قنگەل فسێکم دایەوە ، تۆزێ دانیشتم وەخت بەرەبەری بەیان بو ، مانگیش لە ئاوا بوندا بو ، جـریوە جریوی ئەستێرەکان‌و بریقە بریقی مانگە شەوەکە عینسان تێـری لێ نەئەخوارد ، هەروا تاس ئەیبردمەوە ، جێگەکەم وا هەڵکەوتبو هەمو قۆپی قەرەداغم لێ دیاربو ، هەتا چاو بڕی ئەکرد ، ئەو دارستانی قۆپیە وەکو ئاوێکی زۆر مەنگ‌و کش‌و مات‌و سەوز ڕاگیرابو ، شنە شنی ئەو با فێنکە کە ئەهات خشپ‌و هوڕی بەو گەڵایانە ئەخست ، لەولایشەوە تازە شەبەق بەیـانی دابو ، قەراغ‌و بیجاغی عاسـمان سپی داگەڕابو ، هەرچەندم ئەکرد تێرم لە ڕوانینی نەئەخوارد .

لەخوارەوە لەبەر دەممـدا لەو ناو قۆپیەدا جار جـارە لورە لوری دەعباو مەعبا ، زریوە زریـوو فڕکو هوڕی چۆلەکە کـەوا تازە لە خەو هەڵئەسان‌و ئەگەڕان ، دڵمی دائەخورپاند ، لەو ناو قۆپیەدا ، ناوبەناو شوان‌و موان ئاگرۆچکەیان کردبوەوە ، بریسقو هوڕی ئەو ئاگرانەش

له دوره‌وه ، ئه‌توت گوڵه ئه‌ستێره‌یه ئه‌نوێنێ ، ئه‌و ڕۆناکییه بێ‌تۆزه ، ئه‌و با خۆشه بۆنداره ، ئه‌و که‌ژو کێوه سه‌وزه ، ئه‌و دانیشتن‌و پاڵ دانه‌وه‌یه ، ئه‌و بیرکردنه‌وه‌یه ، هه‌روا توزلقانه‌یه‌کی مابو له خۆشیانا ببورێمه‌وه ئه‌م‌ویست هه‌تا ماوم له دنیادا له‌و جێگاو سه‌عاده‌ته‌دا بومایه ٠ له‌پڕێکا کابرای قطارچی گرمانـدی وتی فلانه‌که‌س فلانه‌که‌س وتم هه‌ی به‌ڵێ باقه ئه‌وه چیه کوره ، وتی دره‌نگه هه‌ڵسه به ڕێکه‌وه بڕۆین ، منیش هه‌ناسه‌یه‌کی ساردم هه‌ڵکێشا هه‌ڵسام داپه‌ریم بۆ خواره‌وه ، له‌و سه‌ره‌و لێژه‌یه ، به دۆ سێ قه‌له‌مباز خۆم گه‌یانده خواره‌وه ، پێش هه‌تاو که‌وتن گه‌یشتینه ده‌ربه‌نده‌که باوه‌ڕ ئه‌که‌ن ئه‌وێشم به‌قه‌ده‌ر سه‌ره‌وه لا خۆش بو ، له‌م‌لاوه ئه‌و به‌ردو تاوێرانه چـون به ئاسماندا ، سه‌ریان گه‌یشتۆته که‌شکه‌شان ، سه‌ر هه‌ڵ‌ئه‌بڕی کڵاوت ئه‌که‌وێته خواره‌وه ، تافه‌تاف‌و هاژه هاژی ئه‌و ئاوه سپی‌و سارده که ئه‌هاته خواره‌وه ، ئه‌و با فێنکه خێرا خێرا ئه‌یدا به سه‌رو چاوما له‌خۆشیانا قاچم نه‌بو بڕۆم به‌ڕێوه ٠ له‌به‌ر ده‌ربه‌ندا ، جۆگه‌له‌یه‌کی نه‌شمیله‌و خنجیله ڕێك‌وپێك هه‌ڵگیرابو ، هه‌ر چوار لای زه‌ردو سۆر له وه‌ختی دارستان‌و سه‌وزه گیاو گوڵی زه‌ردو سۆر له وه‌ختی هه‌تاو که‌وتندا له قه‌راغی ئه‌و جۆگه‌له‌یه بارمان کوتا به زه‌ویدا ، هه‌تاو تازه ئه‌که‌وت ، بریسقه‌ی هه‌تاوه‌که له معبـین لقی گه‌ڵاکانه‌وه ئه‌یدا به‌ناو جۆگه‌له‌که‌دا ، به پرشنگه‌کانی چاوم ڕه‌شکه‌و پێشکه‌ی ئه‌کرد ٠ کوتوپڕ ئاگرێکی به تێڵه‌تێڵمان کرده‌وه ، چاێکمان لێ‌نا ، قاوه‌یه‌کمان پێ‌کان(١) چونکه به‌ڕێ آسن هاتبوین هێشتا سمون‌و بکسمدو پنیرو ماستی بغداو

(١) نوسینه‌که‌مان وه‌ك خۆی داڕشتۆته‌وه به‌بێ ده‌ستکاری ته‌نها له نوقته‌و فارزه‌دا نه‌بێ . وادیاره مه‌به‌ستی له‌قاوه پێ‌گه‌یاندنه ، هه‌رچه‌نده ئه‌م خووه که‌متر له‌ناو کوردا باوه ، چونکه ته‌نها چـا لێنان بلاوه ، ڕێی ئاسنیش مه‌به‌ستی شه‌مه‌نده‌فه‌ره .

خیارو پورتقالی باقوبەو قیسیو سێوی(١) شارەبانمان ترو بر پێ هەبو بە چاییو قــاوەوە تێرو پڕمان خــوارد ، دوایی سەر خەوێــکمان شکاندو هەڵساین هاتین بەڕێوە • ئیستاکێشو هەتا ئو ڕۆژەی دامێلنە تێوی قبر ئەو خۆشیەم لەبن دانایە •



(١) بەغدای ئەوسا ماستیوای نەبو بە کاروان بگاتە دەربــەند ، هەروەها پرتەقالی زستانو میوەی هاوینەی تێکەڵاو کردوە .

# له كۆتاییدا

پڕ بە دڵ سوپاسی مام مستەفا ( مستەفا صائب ) ئەکەم کە ئەوەندەی بڕوا بە من بو دەستخەتەکەی ( لەخەوما )و گەلێك شتی تری دامیو منیش زۆیخۆمم ستورکرد بەرامبەری ، ئەوی بۆم کرا لــە رۆژنامەو گۆڤاردا وەك لەم کتێبەدا باســکراوە بلاوم کــردەوە ، تاکو هەندێــك لە وێنە فوتوغــرافیە بەنرخەکانیشــم بلاو کــردەوەو سەردەســتەی هەمــویان ( لەخەوما ) ٠

هەروەها زۆر سوپاسی ئەو برادەرانە ئەکەم کە لــە لێکۆڵینەوەی کتێبــەکەدا یارمــەتییان‌دام ، لــەپێش هەمویانــەوە بــرادەران کــاك ئەحمەد غەفورو هاوارو هەندێــك برادەرانیتریش ، هەربــژین و قەڵەم رەنگین بن ٠ هەرچــەند پێویستیش ناکات بــەلام سوپاسی کاك فەوزی صائبیش هەر ئەکەم کە ئازایانە هاتە پێشەوە بۆ چاپــکردنی ئەم بەرهەمە بەنرخەی باوکی ٠

ج ٠ ب

# ئاگاداری

بەپێی ڕێنوسی کۆڕی زانیاری کورد ، کە ئازادەیەك لەم کتێبەدا پەیڕەوی لێ کراوە ، ئەم ئیشارانەی خوارەوە ئەم دەنگانە ئەگەیەنن کەوا لەپالیانا نوسراون :

ڕ = ( ر )ی قەلەو وەك ( قوڕگ ) .
ێ = ( ی )ی درێژ وەك ( پیاوەتێ ) .
ۆ = ( و )ی درێژ وەك ( مۆرۆ ) .

